مەسعوود محەمەد

# هاوسەنگکردنەوەی
# تەرازوویەکی سەنگەلا

حەکیم کاکەوەیس
لە عارەبییەوە کردوویەتی بە کوردی

## گوتەی وەرگێڕ

دڵنیام لە وەرگێڕانی ئەم بەرهەمە مەزنەی مامۆستا مەسعوود محەمەددا، کە بە دوای وەرگێڕانی (زمانی کورد)دا دێ، هەڵەی زۆرم هەن. پێم چاکە ئەم کارەم ببێتە بناغەی وەرگێڕانی کتێبەکە و هەر کەسێ هەر سەرنجێکی هەیە، لە ڕێی سایتەکەوە بۆمی بنێرێ و ئەگەر زاندرا بەجێیە، دوای ساغبوونەوەی، دەسکاری بکرێتەوە.

با خوێنەر بزانێ کە لەم کارەدا ئەوەندە ماندوو بووم، بە نیوەی ئەو ماندووبوونە کەمتر، توانیم (تاوان و سزا)ی دۆستیۆڤسکی لە سویدییەوە بکەمە کوردی کە نێزیکەی 600 لاپەڕەیە. ڕەنگە قورسترین و بەئازارترین خەم بۆ من ئەوە بی، لە بری دەستخۆشانە، بە چاوی سووک تەماشای ئەم کارە بکرێ، هەر لەبەر ئەوەی لە داڕشتنی ڕستەیەکدا بە هەڵەدا چووبم یا لە تێگەیشتنی وشەیەکدا بەدحاڵیبوون یەخەی گرتبم. ئەوەی دەیەوێ بێڕەحمانە ڕەخنەم لێ بگرێ، با لە پێشدا یەک بڕگەی لێ بکاتە کوردی! دەبێ لە چەند لاوە بۆسەی بەدحاڵیبوون و هەڵەکردنی بۆ دانرابن! من لە هەموو ئەو بۆسانە دەرباز بووم و سەیر نییە سەر تا پام شەلاڵی هەڵە و بەدحاڵیبوون بووبێ و عیلاجیشم سەرنجی خوێنەران و ڕەخنەگرانی بواری وەرگێڕان و زمانە! هەرچۆنێ بێ دەرباز بووم و دوای ئەنجامدانی ئەرکەکەم، گەڕامەوە بنکەی خۆم! وەختە بڵێم: خوایە تۆبە لەو عارەبییەی مامۆستا مەسعوود محەمەدا!

ح. ع. کاکەوەیس، دارەتووی هەولێر 19. 5. 2008

هاوسەنگکردنەوەی تەرازوویەکی سەنگەلا

ڕۆژنامەی «العراق» لە ژمارە 404ی 22ی 6ی 1977یدا گوتارێکی لە بن سەرەناوی «حاجی قادر، شاعیری شۆڕشگێڕ و پێشکەوتنخواز» دا بڵاو کردۆتەوە و ئەمەش دەقەکەیەتی، کە بە شکڵ و شێوازەوە وەکوو خۆی گوازراوەتەوە:

حاجی قادر شاعیری شۆڕشگێڕ و پێشکەوتنخواز
نووسینی ئاسۆ

کاک عەبدولستار تاهیر شەریف کتێبێکی هەیە بە ناوی (حاجی قادر شاعیری شۆڕشگێڕ و پێشکەوتنخواز و دیموکرات و نەتەوەیی کورد) و دکتۆر مارف خەزنەدار پێشەکی بۆ نووسیوە. ئەو کتێبە بەرپەرچدانەوەی کتێبێکی کاک مەسعوود محەمەدە بە ناوی (حاجی قادری کۆیی)یەوە و تا هەنووکە سێ بەشی لە چاپخانەی کۆڕی زانیاری کوردەوە لێ دەرچووە.

کاک عەبدولستار تاهیر شەریف لە کتێبەکەیدا جەخت لە سەر ئەوە دەکاتەوە کە کاک مەسعوود محەمەد لە بازنەی شاعیری کورد، حاجی قادری کۆیی دەرچووە و بە دەگمەن نەبێ لای بە لای شاعیریێتی و لێهاتوویی و شۆڕشگێڕی ئەو شاعیرە و ناوەڕۆکی

شیعرەکانییەوە نەکردۆتەوە. جەخت لە سەر ئەوەش دەکاتەوە کە کتێبەکەی کاک مەسعوود محەمەد سیمایەکی تایبەتی کەسێتی هەیە و جگە لە باسکردنی خۆ هیچی تر نییە و لە کتێبەکەیدا بە وردیی لایەن و بۆچوونی کۆنەپەرستانە دەخاتە ڕوو، لەگەڵ دوژمنایەتیکردنی بیری پێشکەوتنخوازی و شۆڕشگێڕیدا، وەک جنێودان بە هەندێ کەسایەتی شۆڕشگێڕ و دان لە سەر ئەوەش دادەگرێ کە حاجی قادری کۆیی شاعیری چینی دەرەبەگی کۆنەپەرستی کوردستان نەبووە، وەک کاک مەسعوود محەمەد دەیەوێ لە توێی ڕاوبۆچوونەکانیدا، کە لە کتێبە ناوبراوەکەیدا دەریبڕیون بیسەلمێنێ، بەڵکو شاعیرێکی شۆڕشگێڕی پێشکەوتنخواز بووە و لە ناو کۆمەڵگەی زەحمەتکێشانەوە سەری هەڵداوە و بە درێژایی ژیانی، شیعرە سیاسییەکانی و بۆچوونە نەتەوەییە شۆڕشگێڕییە پێشکەوتنخوازیەکانی کردوونەتە چەک بۆ بەرەنگاربوونەوەی دەرەبەگ و کۆنەپەرست و ئیستیعمار و هەموو جۆرە زوڵم و جیاوازییەکی چینایەتی و نەتەوایەتی... بۆ لایەنگریی ئەوەش، دکتۆر مارف خەزنەدار لە پێشەکییەکەدا دەڵێ: (حاجی شۆڕشگێڕ بوو و دژی دەرەبەگیش بوو و پێداگوتنی بە سەر هەندێ لە نوێنەرانی ئەو چینەدا لە بواری کەسایەتی ئەو کەسەدا بووە وەک کەسێکی باش، نەک وەک چین... حاجی بە شێوەیەکی گشتی دوژمنی چینی دەرەبەگ بووە...) نووسەری کتێبەکە دژی بۆچوونەکانی کاک مەسعوود محەمەدە کە وەک ئارەزووی لێیە، گەرەکێتی بیسەلمێنێ دەرەبەگ، بە تایبەتی لە ناوچەی کۆیە نییە و ئەگەر هەشبێ وەک ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاست نییە، دەنا وەک ئەوان قەڵای مەحکەمیان دەبوو. نووسەر، بە شێوەیەکی گشتی بەرپەرچدانەوەیەکی باش و پڕ بەڵگەی باوەڕپێکراوی لە سەر ئەو بۆچوونانە هەیە کە کاک مەسعوود محەمەد لە هەرسێ بەرگی کتێبەکەیدا، لە بارەی حاجی

قادری کۆییەوە دەریبڕیوە و ژمارەی لاپەڕەکانیان 1131ە کە کەمێکی کەم نەبێ پەیوەندییان بە حاجی قادری کۆییەوە نییە و لەو کەمەشدا، وەک کاک عەبدولستار شەریف لە وەڵامدانەوەکەیدا دەریدەخا، مەسعوود محەمەد سووکایەتی بە شاعیری پێشکەوتنخوازی شۆڕشگێڕ، حاجی قادری کۆیی کردووە کە لە پێناوی بێنەوایانی میللەتەکەیدا دەربەدەری وڵاتان بووە و دەیکاتە شاعیری دیوەخان، کە لە ئامێزی دەرەبەگەکاندا ژیابێ و لە مەجلیسیاندا دانیشتبێ… بەوەش ئەو شاعیرە لە هەموو شۆڕشگێڕی و پێشکەوتنخوازییەک ڕووت دەکاتەوە و دەیکاتە خزمەتکاری دەرباری دەرەبەگەکان. بۆ بەرگریکردن لە شۆڕشگێڕی و پێشکەوتنخوازی ئەو شاعیرە، عەبدلستار تاهیر شەریف لە بەشی یەکەمی کتێبەکەیدا دەڵێ ـ دەبێ زیرەکتر بین تا ڕێ نەدەین ناوی نووسەر و شاعیرانی هەژارانی گەلەکەمان پیس بێ و با شێوازی ژیانیان نەشاردرێتەوە و ڕێبازی ژیان و بیر و بۆچوونیان نەشێوێندرێ بۆ ئەوەی لە پاشەڕۆژدا، بە شێوەیەکی تر سەیریان نەکرێ.

کتێبی وەڵامدانەوەکە، بە شێوەیەکی گشتی کتێبێکی باشە و بەرپەرچدانەوەکە باوەڕی پێ دەکرێ و بە هۆی بەرفرەوانی بابەتەکەوە، ناتوانین لەوە زیاتر لەم لاپەڕەیەدا، نا بەڵکو لەم گۆشەیەدا، لە سەری بڕۆین.

ئەوەشی کە وای لێ کردم لە خەسڵەتی خۆم، کە پشتگوێخستنی هەموو هەرایەک بوو کە لە دوای بڵاوبوونەوەی بەشی یەکەمی کتێبەکەمەوە بە دەورمدا بەرپا کرا، لا بدەم دوو شت بوون: یەکەمیان ئەوە بوو کە نووسینەکە لە ڕۆژنامەی (العراق)دا بڵاو کراوەتەوە و لێپرسراوانی ئەو ڕۆژنامەیەش لەوە دڵنیایان کردبووم کە ڕۆژنامەکەیان لە ڕەفتاردا ئازادە و نایەوێ بە دوای هیچ لایەنێکی سەر بە فەلەکی کورددا بڕوا، بەڵام بڵاوکردنەوەی ئەو نووسینە و قسەی هەندێ لەوانەی کە لەوێدا قسەیان دەڕوا، ئەوەی سەلماند کە بە هیچ جۆرێ بێلایەنییەکەی ڕاست نییە و ئەوەش هەموو هاوکێشەیەکی بێلایەنی بە سەر یەکدا دەڕووخێنێ. دووەمیشیان ئەوەیە کە نووسینەکە بە عارەبی نووسراوە و ئەوەش بۆ ئەوە دەبێ خوێنەرانی عارەبی باوەڕی پێ بکەن، چونکە ناتوانن سەرنجی کتێبەکە بدەن کە بە کوردی نووسراوە. بە گردبوونەوەی ئەو دوو هۆیە نەختێ بە دوودڵییەوە وای بۆ چووم، نووسینێک بڵاو بکەمەوە و تیایدا باسی واقعی کتێبەکەم و ئەو بارودۆخە بکەم کە بۆ نانەوەی هاتوهەرا لەبارە. دوای ئەوە هەندێ سەرنجم لە پیاوماقووڵانی عارەبەوە پێ گەیشتن بەو ڕێگایەدا بڕۆم کە لە خۆمم داخستبوو و بچمە ناو بابەتێکەوە کە هەموو تەمەنم هەوڵم داوە نەفسم ڕابێنم تا بە سەر شتی لەو بابەتەدا گوزەر بکا، کە ڕەنگە پروشکی بە هەموو ئاڕاستەیەکدا بڵاو بێتەوە، پێش ئەمەش نووسینگەلی لە ئاستی ئەو نووسینەی سەرەوە، چ بە کوردی و چ بە عارەبی بڵاو کراونەتەوە و یەک بە دوای یەکدا پشتگوێم خستن چونکە خۆمم بەوە وابەستە کردبوو بێ ئەوەی گوێ بە گاڵەگاڵ بدەم بە سەریاندا تێپەڕم و ئەمانەش لەو لاپەڕانەدا بڵاو دەکرانەوە کە چاوەڕوانیی ئەوەیان لێ دەکرا و لەو جێیانەدا دەبوونە بەشێکی گشت و تیایدا هەڵدەگیران و دەبوونە لقێکی قەدی دارێکی کە سەرچاوەکەی

دەیهەژێنێ و پلەوپایەی لە سێبەرێک زیاتر نابێ و ئەوەی ململانێی دەکا، بە سەریشیدا سەرکەوێ، هەر دۆڕاوە. ئەگەر لە نووسینەکانمدا لەگەڵمدا بووبی دەبینی لە هەموویاندا دەمەتەقێی بیرەکانم کردووە نەک هەڵگرانیان یا دەروێشەکانیان یا مشەخۆرانی سەریان چونکە دەمەتەقێی ئەو کەسانە بە فیرۆدانی کۆششە و چ سوودی نییە و قسەکردن لە سەر تاکی شتەکان و تاکی کەسەکان زیتبوونەوەیەکی بێ سوودە مەگەر هەموو تاکی شتەکان کۆ بکرێنەوە و یاسای گشتی دانێن تا ڕەخنە شێوەیەکی گشتگری هەبێ و هەموو شت و هەموو کەسێک کە تیایدان بگرێتەوە. هیواداریشم ڕۆژنامەی (العراق) ئەو نووسینەی لەو ڕووەوە بڵاو کردبێتەوە کە (زەرەربەخش سوودی هەبوو) چونکە بڵاوکردنەوەی، ئەو دەرفەتەی بۆ ڕەخساندم ڕووی قسانم لە عەقڵی عارەبی بکەم و هەندێ لەو کارەساتە فکری و ڕەوشتییانەی کە دەستیان بە سەر ئاسۆی بەرچاوی ئێمەی کورددا گرتووە ڕوون بکەمەوە و (ڕەنگە ڕقتان لە شتێک بێ سوودی بۆتان هەبێ) و مافی ئەوەشتان لە سەرم هەیە هەرچی دەیڵێم لە سەرم ماڵە تا ڕووی ڕاستی بدۆزینەوە و ڕاستیش شەرەفی وشەیە و ئەوەشم لە سەرەتای بەشی یەکەمی کتێبەکەمدا کردۆتە دروشم و لە هەموو هەڵکەوتێکدا کە جێی بووبێتەوە دووپاتم کردۆتەوە و کردووشمەتە بەڵگەی تۆمەتبارکردنی هەموو قسە و کردارێک کە ڕاستی تێدا نەبێ و مەودام نەبووە جگە لە چەکی ڕاستگۆیی کە بڕندەترین چەکە، بە هیچ چەکێکی تر بەرەنگاری درۆ ببمەوە، بە تایبەتی من کە هیچ چەکێکی ترم نییە بەرەو ئامانج دەستم بگرێ، ئاخر بە بێ چەکی ڕووناکی ناتوانی بەرەنگاری تاریکی ببیتەوە... مافی بەرژەوەندی گشتیشم لە ئەستۆدایە کە زۆر لە وردبوونەوە قووڵ نەبمەوە تا خۆم لە ورووژاندنی شتگەلێ لادەم کە ڕووی مەجلیسیان نییە و نووسینەکەم

لە سەر ڕووی بابەت بمێنێ و چەندەی بۆ بە دەستهێنانی حەقیقەت لە ژێر چینە تاریکەکاندا پێویستە، هەر ئەوەندە بە قووڵاییدا ڕۆبچێ.

ئەوەش لە سەرەتاوە دەڵێم کە جوانترین و بەرزترین و تەواوترین شتێ کە لەو نووسینە ناوبراوەدا هەیە ئەوەیە لە هەموو ڕوویەکەوە ناهەقە و ناتوانێ هەڵبەستراوێکی گەورە لە پەنای ڕاستییەکی بچووکەوە لە خەڵکی بشارێتەوە، وەک دڵۆپە مەرەکەبێک وا لە پەرداخێک ئاو دەکا هەمووی بە مەرەکەب بچێ، بەڵکو وەک عەکسی وێنەیەکە ئەگەر هەڵینەگێڕیتەوە ڕاستییەکەی دەرناکەوێ، ئەوەش جێیەکە بۆ نیگاکردنی کەسێک کە بیەوێ شتی پشتەوەی ڕووە دیارەکان دەربخا، کە هەموو ڕۆژێک و بە بەلاش هەڵناکەوێ خەڵکی تەماشای درزێک بکەن کە هەق نە لە بەردەمیدا هەیە نە لە پشتیەوە و نە لەملاوئەولای و ئەوەی لە پشت ئەو سووربوونە زەقەشەوە هەیە، نیازێکی قووڵی ناحەزایەتیکردنی ڕاستییە و بوێرییەکی دەگمەنە ڕوو بە ڕووی هەق، بە هاسانی و بە بێ شەرمیش دەرپەڕیوەتە سەر زەمینێکی ئامادەکراو کە بەرفراوانییە خۆبەخۆکەی ئەوە بۆ بینەر دەردەخا هەڵبەستراو لایەنە ڕەسەنەکەی قسان بێ، چونکە سەرجەمی سیمای وێنەکە، بە دووری و درێژییەوە بەڵگەی بەهێزی هەیە لە کۆکردنەوەی خەسڵەتگەلێکدا کە بە دەگمەن نەبێ لە یەک شتدا کۆوە نابن و بە شێواندنی بێ سنووری هەموو ئەوەی لە منەوە و لە بارەی ڕاستییە بەرزەکانی ژیانی حاجی قادرەوە گواستوویەتیەوە، سەرچاوەی لە کینەیەکەوەیە بەرانبەر ئەو چاکانەی کە لە ژیانی ئاساییدا هەن بێ ئەوەی بەو ڕەنگە خوازراوانە ڕەنگ کرابێتن کە بە دڵی دڵڕەقە و بە دڵسۆزیی زیادەڕۆییەوە بۆ ئەو لایەنە شێوێنەرانە و خۆبەنجکردن و خۆداخستن لە ڕووی هەق وەک هەڵوێستی ئەو شاعیرەی کە لەگەڵ

هەڵکردنی هەر کزەبایەکی نەرمدا زەوی لە بن پێخەفی مەخمەل و ئاوریشمی درۆودەلەسە دەهێنێتە لەرزە. ئەمانە خەڵکانێکن زۆر لە هەڵخەڵەتاوەکان پتر دوژمنی ڕاستین کاتێ خەونەکانیان بەر ڕاستی دەکەون و دوورایی ڕێژەیی تایبەت بە خۆی، بە توندی بەرانبەر ڕەوایەتی دەگرێ، چونکە ئەوەندەی کۆمەڵگەی کورد بە نەبوونی ماددی و پلەوپایە پەیوەستە، کە بیستوپێنج سەدە یا زیاترە بە سەریدا دراون، توندوتیژی لە تاریکیدا بەرانبەر ئەو ڕووناکییەی کە ڕاستی، هەر ڕاستییەک بێ، دەیداتەوە توندوتیژتر دەبێ چونکە هەموو شتێک لە تەرازووی بەرژەوەندیدا ڕێژەییە و لە نەتەوەیەکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازی هەیە و تەحەددای عارەب دەکەم، بۆ نموونە، ڕقی عارەب لە حەقیقەت ئەوەندەی ئەو چەند دێڕەی سەرەوە کە گواستوومەتەوە بیخنکێنێ، یا کەسێک بە قەدەر ئەو چەند دێڕە ئێستای ئیفلاسی کردبێ لە گواستنەوەی هەر وێنەیەکی ڕاستی لە سەر واقعی ڕابردووی میللەتەکەی و مەحاڵە ڕووی زەوی عارەبێک بگرێتە خۆی کە لە ڕووی جیاوازی بۆچوونەوە بڵێ دوژمنایەتی ئەبوو جەهل بۆ ئیسلام بە هۆی جیاوازیی باوەڕەوە بووە نەک ترسی لەدەستدانی حوشتر و کۆیلە، و مەترسی باوەڕ بەرانبەر ناتەبایی ئەگەر ئەبوو جەهل لە چوارچێوە ماددییەکەی دەرکا، دەوروبەری عارەب دەگۆڕێ. جگە لەوەش ئەگەر عارەب یەک بەڵگەی ماددی لە بارەی چاوچنۆکی ماددی ئەبوو جەهلەوە لە دەستیش بدا، زۆر بەڵگەی تری درێژایی مێژووی چەندین سەدەی دەوڵەمەندی بە دەستەوە دەمێنێ تا هەموو گومانەکان بڕەوێنێتەوە. مەسەلەکە بۆ کورد، لە هەڵوێستدا بەرانبەر بە مێژووی گەلەکەی وا نییە چونکە ئەگەر بەو بیر و باوەڕەوە مێژووی لێکدابڕاوی خۆی داڕێژێ کە شەڕی چینایەتی تێدا نەکراوە، دنیای بە سەردا دەڕووخێ ئەگەر یەکێ بڵێ حاجی قادر داوای شەڕی چینایەتی

نەکردووە و ئەوەشی بە بیردا نەهاتووە ململانێی موڵکدار و سەرۆکخێڵ و شتی لەو بابەتانە بکا چونکە ئەگەر ئەو کوردە ناوبراوە بە خەیاڵ، لە ناو واقعی خۆیدا بێ و بە ئاشکرا ململانێی چینایەتی خەلق بکا تا لەگەڵ بوونی خۆیدا بیگونجێنێ، دیارە بۆ هەڵکەوتی تر کە ئەو تاکە ئەگەرەی تێدا نەبێ کە خۆی دەیەوێ هەبێ و شەرعیەتی تێدا بە چینەکان بدا، چۆن ڕازی دەبێ حاجی قادر ئەو مرۆڤە ڕوونە بێ کە شیعرەکانی دەریدەخەن و سەردەمەکەی گەرەکی بووە و حەقیقەتی نەتەوەکەی بووە و داوای برایەتی هەموو کورد و یەکڕیزی کردووە تا بتوانن مافی نەتەوەیی خۆیان دەستەبەر بکەن و ژێی مەردایەتی و نەفسبەرزی و شتی لەو بابەتانەی بزواندبێ کە هەستی کوردبوونی کورد دەورووژێنن، نەک چینایەتی، ئەگەر بۆ عارەب ئاسان بێ وا لە ئەبوو جەهل تێبگا کە گوێی بەوە نەداوە ماڵی لە دەست بچێ، بۆ نووسەری ئەو گوتارە ناوبراوە ئاسان نییە قەبووڵی بێ (حاجی قادر) سەر بە فەلسەفەیەکی چینایەتی نەبووبێ و ئەگەر وا بێ هەر دەبێ لە ڕۆژنامەکانی ئەمڕۆدا بهێندرێتە قسە و ئەوەی ئەوسا لە سەردەمی خۆیدا نەیگوتووە ئێستا بیڵێ و زۆریش ئاسانە قسەکانی و کردارەکانی و ڕاستی هەڵوێستەکانی بخرێنە بن شیکردنەوەوە تا بۆ پێچەوانەی خۆیان هەڵبگێڕدرێنەوە و لەگەڵ ئەوەدا کە لە ئەمڕۆی تاریکدا چاوەڕوانی لێ دەکرێ بگونجێ. چۆن دەبێ لەو شیعرانە بێدەنگ بن کە بۆ ئەوانەی گوتوون کە بە پێی نۆڕینی ئەم سەردەمە بۆ چینەکان لە سەر دەرەبەگ حسێب کراون و ئەگەر نەکرێ بزر بکرێ دەبێ واتای ون بکرێ ئەوەش بەوەی کە بۆ تاکەکانی ئەو چینە گوتراوە نەک چینەکە بەخۆی کە حاجی چ ڕێی نییە ئەوە نەبێ ڕقی لێی بێ و ئەوەش دەزانین کە بادانەوە لە قساندا لەو بابەتەیە بڵێین ئەبوو نەواس حەزی لە سەرجەمی شەراب نەبوو بەڵکو حەزی لە تاکەتاکەی ئەو

پێکانە بوو کە دەیخواردنەوە، تەنانەت ناتوانێ بە سەر ئەوەشدا بگوزەرێ کە ئەو شیعرانەی کە حاجی قادر بۆ کرێکارانی نەگوتوون تا دژی چەوسێنەران ڕاپەڕن، بووە ئەرک تا فریای ئەو ماڵوێرانییە بکەون و بە زۆر حاجی بەو شێوەیە بێننە قسە کە لە زاری چاوەڕوانکەرانی ئەم سەردەمە خۆشە و ئەوەش نابێتە ڕێگر کە یەکەم کەس لە سەر بابەتی چینایەتی شیعری گوتبێ، چل ساڵ یا زیاتر دوای مردنی حاجی گوتوویەتی و مەودای هەڵبەستن لە گۆڕەپانی کوردیدا بە هۆی ئەو دواکەوتوویییەوە کە سنووری نییە و بە هۆی شتی تریشەوە کە وردە وردە بە دەم ئەم کتێبەوە دەردەکەوێ ئەوەندە فرەوانە کە لایەنی تری کورد هەیە کەس هەتا ئێستا هیچی لە بارەوە نەگوتووە. گۆڕەپانی کوردی بەخۆی، بە زیادەوە ئەوەندە تەنگەبەرە و بیری چینایەتیش لە چاو میللەتانی ترەوە تێیدا بەرتەسکە، ئەوەش بە پێی سروشتی شتەکان و پێکهاتەکانی، ئەو عەقڵەیش کە پێیەوە سەرقاڵە تەنگەبەرە و بەرانبەر بیری تر داخراوە. ئیدی لەو تەنگەبەرەدا بیری لێ بکەوە کە هەمووی لای ئەو کوردە کاردانەوەیە و ئەگەر ئاوازێک لە دەرەوەی ئەو تەنگاییەوە بێ، بیر لە حاجی قادر بکەوە شاعیری شۆڕشگێڕ و سەرکردەی بارودۆخێک بووبێ کە هێشتا تیۆری تەنگی نەکردۆتەوە و فەلسەفە بەرەکەتی پێ نەکردووە و ئالێرەوەیە هەڵتەکاندنەوەی درووmanی لوقمەخۆر بۆنی ڕاسگۆیی لێ دێ و ڕەنگە ڕووناکاییەکیشی لێوە بێ و هەندێ ڕاستی ڕوون بکاتەوە و ئیدی بازرگانییەکە پەکی بکەوێ و عەرشەکەی بلەرزێ. کەوابێ دەبێ هەموو ئەوانەی ئەو هەوڵە دەدەن دەستنیشان بکرێن و دەورە بدرێن و دەنگیان ببڕێ و شوێنەواریان بزر بکرێ ئەوەش بەو کەرەسەی شێواندن و هەڵبەستن و داتاشینەی کە لای فێڵبازان هەن و ئەوجا هەوڵەکان و خەڵکەکان کۆ دەکرێنەوە و قەڵەمەکان لە سەر سەکۆی

کاغەز دەست پێ دەکەن و دەنگی هەڵخڕاندن بەرز دەبێتەوە و هەر یەکە و لە سەر ناهەقی پشتی ئەوی دی دەگرێ و شایەدیی درۆی بۆ دەدا و هەموو ئەوانە لەو چەند دێڕەدا کە لەسەرەتاوە گوازراونەتەوە دیارن و مەحاڵە بە تەنها یەک تاکە کەس بتوانێ ئەو هەموو ڕق و دوژمنایەتییە بەرانبەر بە ڕاستی لە خۆیدا کۆ بکاتەوە و ئەو هەموو حەزەی بۆ لەخشتەبردن هەبێ: ئەو لاپەڕەیەی ئەو دێڕانەی تێدان، وەک بانکێکی هاوکاری وایە لە بوختاندا و هەر خاوەن پشکێک تیایدا بەشی جیاوازی لەگەڵ ئەوی تردا هەیە. بێ منەتییەکی کە لە بوختانکردندا گەیشتۆتە ئەوپەڕی ئەوپەڕ بەڵگەی ئەو بۆشاییەیە کە گەلی کورد لە بواری کۆمەڵایەتیدا بە شێوەیەکی گشتی، بە دەستیەوە دەناڵێنێ. نووسەری هیچ میللەتێک نییە بە بەر چاوی ئەو عالەمەوە ڕۆژ بکاتە شەو و شەویش بکاتە ڕۆژ، ئەوەش لە چوارچێوەی شانازاییەکی کە بە زیندەچاڵکردنی ڕاستییەکانەوە دەیکا کاتێ لە چاڵی درۆدا دەینێژێ و بە گاڵتە پێکردنیشەوە زمان لەو خەڵکە دەردێنێ کە بە دڵیان نییە و ئەوجا بە بێ ئەوەی گەردی ڕەخنە لە کلکی بنیشێ دێت و دەگەڕێتەوە سەر سەرمایە هەڵاوساوەکەی خۆی کە شکاندن و وردکردنی ڕاستییە و لە خۆشییاندا بسکەی سمێڵیشی دێ.

دەیهێنمەوە بەر خەیاڵ، نووسەرێکی عارەب کەیفی لێ بێ کەسایەتی یەکێ لە سەرکردەکانی شۆڕشی بیست لەکەدار بکا ئەوەش لەو ڕێیەوە کە سەرکردەکان سەر بە چینی (دەرەبەگ)ن، بزانە چۆن دەیان قەڵەمی بەرچاوڕوونی لێ تیژ دەکرێن و بە تووڕەیی و گرماندنەوە مەسەلەکان دەگێڕنەوە جێی خۆیان و هەڵسەنگاندن بە پێی تەرازووی ئەو سەردەمە دەکەن کە شۆڕشەکەی تێدا بەرپا کراوە. لەوانەشە لە ناو ئەو قەڵەمانەدا تاکوتەرا هەبن بەرگی لێبوردن فراوان

بکەن و لەوەش ببوورن کە لە سەردەمی خۆشیدا هی لێبوردن نەبووە و چاوپۆشی بە سەر هەموو بوارێکی ئەو کەسەدا دادەبارێ کە ئەنجامی داوە و خێر بە سەر شەڕدا زاڵ دەبێ و (چاکەکان بە سەر خراپەکاندا سەردەکەون) و دەتوانی ئەو وێنەیە ڕوونتر بکەیتەوە و تووڕەیی عارەب بەرانبەر (شعووبییەکان) بدەیتە بەر زەین لە یەکێ لە هەڵچوونەکانی مێژووی عارەبدا کە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان ئاگرەکەی دەگرێ و سوارەکان لە ڕمبازێدان و عارەب بە گشتی سوپاسیان دەکەن گوایە پارێزەری شەرەفی نەتەوەیی عارەب و شانازییەکانین. مەسەلەکە لە جیهانی کورددا کە قامچی تاوانبارکردنی ناچینایەتی بە سەریدا زاڵە و بەرانبەر هەر کوردێک بەرز دەکرێتەوە شانازی بە ڕابردوویەوە بکا، وا نییە و لێشیەوە نێزیک نییە، بەڵکو بە پێچەوانەشەوەیە. بەختی عەباس ئاغای کوڕی مەحموود ئاغای پشدەری کە لە سەرەتای بیستەکاندا بەرانبەر ئینگلیز ڕاپەڕی و لە هەموو ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی کۆیە دەریکردن و بە کوشتن و برینداركردن و سووکایەتی پێکردن کەوتە گیانیان، قەت وەک بەختی (شێخ خومەیس زاری) نابێ کە هەمیشە بە چاکە ناوی دەبرێ بە وێنە و دەنگ و خوێندنەوەی عارەبی یادی دەکرێتەوە و خزمەکانی عەباس ئاغاش ناوێرن بە ئاشکرا ناوێ بێنن و ڕەنگە پێیان باشتر بێ هاشای لێ بکەن. بۆ ئەوەی تاکێکی کوردی پێشان هەندە بهێنێ بە چاکە ناوی بهێندرێ دەبێ بە پێی پێوانەی ئەمڕۆ کەرەسەی شانازی لە مارکسیزم و سۆسیالیزم و جەماوەریدا هەبێ تا لای زۆرینەی ڕۆشنبیرانی کورد کە بۆچوونیان لەوەش مەترسیدارترە بڵاو دەکرێتەوە، چونکە مارکسستی کورد ئەوەی لە پلەی یەکەمدا بە لاوە گرنگ نییە باسی مێژووی کورد و ڕووداوەکانی و کەسایەتییەکانی بکا، ئەو یەک شتی پێ گرنگە ئەوەش هێنانەوەی بەڵگەیە بۆ ئەوەی باوەڕی مارکسیزم لەو

باسانەدا ڕاستە و مارکسیزم[1] نەبێ هیچی تر ڕاست نییە، جا هەر بۆچوون و باوەڕێک بێ. لە هەندێ جێی بەشی یەکەمی کتێبەکەمدا گوتوومە کە ئەو خەڵکە مێژوو دەهێنن و سەریدەبڕن و کەوڵی دەکەن، ئەوجا کفنی تیۆرییەکانی خۆیانی پێوە دەپێچن و بە خەڵکی دەڵێن بزانن ئەوەی ئێمە دەیڵێین چەند لەگەڵ مێژوودا ڕاست دێتەوە! ئەی خوێنەری عارەب باش بزانە کە هیچ قوتابخانەیەکی لە ناو ئەوانەدا کە دەستیان بە سەر دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردیدا گرتووە، جگە لە مارکسیزم کە تایبەتمەندە بە بنیاتنانی عەقڵی کوردی ئەم سەردەمە مەترسیدار نییە و ڕەنگە پێت سەیر بێ ئەگەر بڵێم بڵاوکردنەوەی کتێبێکی کوردی لە ڕێی کۆڕی زانیاری کوردەوە بە ناوی (ڕێکەوت لە تەرازووی ژیریدا) کە نووسەرەکەی ڕای خۆی لەوەدا دەربڕیوە بوونی پەروەردگار بسەلمێنێ، ڕقی پاسەوانە کوردەکانی مارکسیزم بە سەر کۆڕدا هەڵڕژا و پاڵی بە قەڵەمەکانیانەوە نا بۆ دەربڕینی نارەزایی و ڕەخنەگرتن و شتی لەو بابەتانە لە چاپەمەنییەکاندا و ئەوەیان لە موسوڵمان بە زیاد دەزانی لە وڵاتی خۆیدا بەرگری لە باوەڕی ئاینیی خۆی بکا و دەهۆڵیشیان بۆ کۆڕ لێدا کە ئەو کتێبەی بۆ چاپ کردووە و لێپرسراوانیشیان ئاگادار کردەوە کە ورووژاندنی باوەڕداری و بێ باوەڕی بشێوێنی دەنێتەوە بەڵام لۆمەی وڵاتێک ناکەن لە بارەی باوەڕنەبوونەوە بە خودا بەردەوام کتێب چاپ دەکا و بڵاوی دەکاتەوە و ئەمەیان چ ورییایی ناوێ و چپەچپی بشێوێنی لە ئارادا نییە.

---

[1] لە زۆر جێدا، چ لە نووسیندا چ لە ئاخاوتندا دیومە جیاوازی لە نێوان مارکسیزم و مارکسستدا نەکراوە، بۆیە بە کورتی دەڵێم: مارکسیزم بیر و فەلسەفەیە و مارکسست ئەو مرۆڤە یا کۆمەڵە خەڵکەیە کە باوەڕی بەو بیر و فەلسەفەیە هەیە. (وەرگێڕ)

مادام مارکسیزم چەترێکە و کوردی ماندوو و مردوو لە بنیدا دەحەوێنەوە و لە گوناهان پاک دەبنەوە و لە دێو پارێزراون، سێبەرەکەی لە ناو ڕۆشنبیراندا بە شێوەیەکی ناحەز و ناشرین دەبینی و هەر دەڵێی کەشتی نووحە و لە هەر بابەتە و جووتێکی تێدان و خوا پەنای خنکاوانیش بدا. ویژدان لێی دەوێین ئەوە بڵێین کە کوردی مارکسست ئەگەر دڵسۆزی باوەڕەکەی بێ و لێی بزانێ و بە پێی توانا پابەندی بێ، هەرای لەوانی دی کەمتر دەبێ و بەختی لە گوتوبێژدا زیاتر دەبێ و پتر لە خۆپێگەیاندن دوور دەکەوێتەوە، چونکە بۆ تێرخواردن لە دەرگای مارکسیزمی نەداوە و لەبەر ئەوە لەو گەندەڵییە پارێزراو دەبێ کە دەبێتە کەری تەماح. لەم قسەیەمدا موجامەلە ناکەم و بارودۆخەکەش بواری موجامەلە نادا بەڵام ئەوە ڕاستییەکە و دەبێ بگوترێ و زماندرێژترین و بێویژدانترین کەس و بێمنەتترینیان بەرانبەر هەرچی بەرز و پیرۆزە ئەو مشەخۆرە سوودمەندە ویژدان باقوبریقانەن کە لە ناو هەموو میللەتان و باوەڕێکی هەموو جێیەک و سەردەمێک هەن و لە هەموو کەسیش ئامادەترن بۆ لادان بەرەو بەرژەوەندی، ئا لێرەوە خلیسک دەست پێ دەکا و ڕەنگە مشەخۆر لێی بخلیسکێ. بە قەدەر ئەوەی ڕەقیی لە باوەڕدا پاڵنەرە بۆ لادانی هەڵگری خۆی بەرەو کێشە و سەرهێشە، دەشێ ئارەزووی مشەخۆر ڕێگا بێ بەرەو تالووکە ئەوەش لە بارودۆخەکەیدا دیارە، زوو زوو دەگۆڕێ و هەموو جارێکیش گۆزە بە سەلامەتی دەرناچێ و یەکەم هۆی شکانی بە دەست مشەخۆرەوە زاڵبوونی سروشتە توندەکەیەتی ئەوانەش شتگەلێکن لە کۆنی کۆنەوە شایەدیمان بۆ دەدەن و کتێب و کاغەزیان لێ پڕ کراوەتەوە تا ئەوەی وەک لە کلیله و دمنەدا هاتووە، لە سەر زاری ئاژەڵیشەوە گوتراوە.

گردبوونەوەی کورد لە بن خێوەتی مارکسیزمدا، دەوڵەمەند و هەژار بە هەموو ئایین و جۆر و چینێکەوە کۆ دەکاتەوە. ئەگەر تەماشایەکی ساڵانی یەکەمی شۆڕشی تەمووز بکەی، لە ڕێکخراوە مارکسیەکاندا ناوی وەک زانا ئایینییە ئازادیخوازەکان و ملْکدارە ئازادیخوازەکان و بازرگانە ئازادیخوازەکان دەبینی و بوونی ئەمانە لە ناوچەرگەی کورددا ئەوەندە بەهێز بوو هەموو زانایەکی ئازادیخوازی ڕاستەقینە و ملْکدارێکی ئازادیخوازی ڕاستەقینە و بازرگانێکی ئازادیخوازی ڕاستەقینەی لە گۆڕەپانەکاندا لابرد چونکە ڕێزگرتنی ئەمانە لە خۆیان تا لەو بەهایانە دانەماڵدرێن کە لە بەر دڵان بوون بەرانبەر سوودێک مەودای مانەوەی کەم و نەمانی مسۆگەر بێ، گۆڕەپانی خۆپیشاندانیان بۆ خەڵکانی خۆی جێ هێشت و لە پشت پەردەی ڕێزلەخۆگرتنەوە بزر بوون، لە کۆنیشەوە گوتراوە ئابڕوو بەر بە ڕزق و فوسق دەگرێ و لەم قسەیەشدا ڕاستگۆ بوون.

خوێنەری عارەب دەبینێ وەکوو کەسێ ڕووی قسانی لێ دەکەم کە لە بۆچوونەکانی دڵنیا بێ و قسەش لە سەر ڕووبەرێکی فرەوانی بوونی کورد و بواری گردبوونەوە و لێکدابڕانی دەکەم و چ بەڵگەش بۆ بۆچوونم لە بارەی مەسەلەگەلێکەوە ناهێنمەوە کە مارکسیە کوردەکان ڕووبەڕوومی دەکەنەوە، مەگەر لە تاقیکردنەوەی گشتییەوە کە لە سەردەمی پەرەسەندنی مارکسیدا، ساڵی 1959 کە هەموو دنیای کوردی وەک بەشێکی عیراقی گرتەوە. بەڵام زۆر نابا پێوەرێکی دەخەمە بەر دەست کە بەرپەرچ نادرێتەوە و ئەو نووسینەی پێ هەڵدەسەنگێنێ کە لە (العراق)ەوە گواستوومەتەوە لەگەڵ ئەو بەرپەرچدانەوەیەدا کە لەم چەند لاپەڕەیەی پێشتردا هەیە و کەس بۆی هەڵناکەوێ گومان بخاتە سەر ئەو پێوەرە چونکە وەرنەگێڕدراوە

تا گومان لە وەرگێڕانەکە بکرێ. ئەو نووسینانەی باسم کردن چەند ساڵێک پێش ئەو گمەگمە کەوتوونەتەوە کە بە دەورمدا بەرپا کراوە و لە گومانی داهێنانی بیانووی بێ تاوانی پارێزراوە و لە دەرخستنی ڕاستگۆییدا لە هەردوو سەری ململانێکە گردەبڕترە.

ئەم گوتارەی خوارەوەم نارد و لە کۆبوونەوەیەکدا، کە لە کۆیە بۆ یادی حاجی قادر لە هاوینی 1971دا ساز کرا، خوێندراوەتەوە:

کۆیە: ڕێزداران، ئەندامانی کۆمیتەی ئاهەنگی یادی حاجی قادر

ئەم ئاهەنگەتان بەرجەستەکردنەوەی موعجیزەیەکی نیشتمانی کوردی سەدەی نۆزدەیەمە، یادکراویش پێش سەردەمی خۆی کەوتبۆوە و بە چاندنی تۆوی بیری نەتەوایەتی لە ناو کورددا لە پێش وەرزی چاندنیدا، بە سەر بنەمای مێژوو و دەستوورەکانیدا زاڵ بوو و لە ژیانی خۆیشیدا کە زۆربەی بەر لە نێزیکەی سەد ساڵ بە سەر بردووە، ڕێگەی بۆ وەچەی ئەتۆم و ئاسمانگەڕیی ڕووناک کردۆتەوە و ئێستاش لە سەفەری خەباتی گەلی کورددا پێشرەوی هەنگاوەکانێتی لە ڕێڕەوی خەباتیدا و لە بواری فکر و سیاسەتدا ڕێنمایی سەرکردەکان دەکا و هەر دەڵێی بلیمەتێکی هەڵکەوتووی وەچەی ئێمەیە و سەردەمی ڕابردوو بۆی پێکهێناوین و بە زمانی غەیب باسی ڕووداوەکانی پاشەڕۆژ دەکا، لە سەرسوڕهێنەریدا لە موعجیزە کەمتر نییە کە یەکەم دەربڕینی لە بارەی واتا نەتەوەییەکانەوە پەنجا ساڵ پێش یەکەم کەسانێک کەوتبێتەوە کە بە زاریاندا هاتبێ. لێشی دەوەشایەوە لەگەڵ ئەو پێشکەوتنە فکری و ماددییەدا دەربەرێ کە لە دوارۆژەکانی ژیانیدا ڕوویان کردە ئەم ڕۆژهەڵاتە نێزیکەی ئێمە و هیچ بۆشاییەکیش نەهێڵێ کە ڕێی تێ دەچوو بکەوێتە نێوان لێهاتوویی پێشوەختی ئەو و بەرەژانی زەمانی ئاساییەوە، ئەگەر ئەو بۆشاییانە زۆر لە توانای ڕۆژگار و ڕووداوەکان و توانای پێشکەوتنی هەمەجۆر و هەمەلایەن فرەوانتر نەبوایە لەو بۆشاییەی نێوان ئەوەی حاجی پێی گەیشت و ئەوەی مێژوو دوای دەیان ساڵ پێی گەیشت. ئەو بۆشاییە لە پێکەوە گرێدانی واقیعدا وەک نموونەی سەرکەوتنی بە سەر سەردەمی خۆیدا مایەوە و بووە بەڵگەی داهێنانی پێشوەخت لە ڕێی هونەرێکدا نەتەوەیەک لە نەتەوەکان شانازی پێوە بکا ئەوەش هونەری

پێشکەوتنە لە پێناوی پیرۆزڕاگرتنی وڵات و بێ تەماحیی لە دنیادا لە پێناوی نەتەوەدا و بە خەرجدانی دوا چۆڕی هۆش و ڕۆح بۆ بەرزکردنەوەی ورە و پاککردنەوەی ئەو دڵانەی ژەنگ لێی داون. لە مێژوودا، بە دەگمەن کەسێک بووە لە ڕۆژگاری خۆیدا بۆ پێچوپەنای غەیب ژیابێ و لە سەر سەکۆی سەردەمی خۆیەوە ڕووی دەمی لە نەوە و وەچەی ئەوانەی سەردەمی خۆی کردبێ و تا ئەوپەڕی قوربانیدان قوربانی بدا و بگاتە ئەوەی چ نەوە لە دوای خۆیەوە جێ نەهێڵێ تا هەندێ لە پەرۆشییەکانی خۆی بە سەریاندا بدا و بەوەش چەندین پلە کەوتۆتە سەرەوەی هەڵکەوتووە نەمرەکانەوە و مێژوو لە تەواوەتی خۆبەختکردنی مومکین لە ئاستیدا لەوەدا دەستەوەستان بووە و یەکێکی وەک ئەو لە ڕووی بیر و هۆش و پێگەیشتنەوە بخاتەوە.

من باوکی نیشتمانپەروەری کورد لە بەرزیی جەنابیان و بەربەرینیی هۆشی و بەرفرەوانی ئامێز و سنووریدا وەک ڕۆحێک دەبینم کە خۆی بە سەر مێژووماندا داوە و بە سەر سەری بوونی سەردەمانەمانەوە وەستاوە و بە دیار بوونی ئاشکرامانەوە سێبەرە و لە هەموو خورپەیەکی نیشتمانپەروەریدا و لە گشت خەیاڵێکی نەتەوەییدا و هەموو شانازییەک کە بە بیرماندا بێ و خەومان بزڕێنێ و ببێتە بەشێکی هیوامان بۆ مانەوە و تەمامان بە پێشکەوتن بە دیارمانەوەیە. مرۆ چەند هەوڵ بدا بەرانبەر ئەو مەلائیکەتە بەخشندەیە کە چاکەی بە سەر میللەتەکەیەوە هەیە بە وەفا بێ ناگاتە ئامانج و بە دەم هەناسەبڕکێوە دەوەستێ چونکە هیچ قسە و پێداهەڵدانێک و بەیانێک لەگەڵ گەورەیی و مەزنی و ڕەوشتبەرزی ئەو زاتەدا یەکسان نابێ کە هەستی سەروەری و گیانی شانازییە لە دەروونی کورددا بە ڕابردوو و ڕەگ و سەرچاوەیەوە دەیکا و گەردی سەرشۆڕکردن و کڕبوون لە خەیاڵ و

بۆچوونەکانیدا دەتەکێنێ و هانی دەدا بە سەری بەرزەوە شانبەشانی گەلانی زەوی بوەستێ کە لە کەرەسەی سەربەرزیدا لەگەڵیاندا هاوتایە، ئەگەرچی بەخت لە پلە و پایەی خۆشگوزەرانیدا کەمیشی پێ دابێ.

بەشێکی زۆری شانازیم بە خۆمەوە بۆ ئەو مرۆڤە تاک و دەربەدەر و ئاوارەیە دەگێڕمەوە کە فووی بە پشکۆی گەرموگوڕیمدا کردووە و دەماری بۆ ڕاپەڕین بزواندووم و خەیاڵی خۆبەکەمزانینی تێدا لابردووم و بارودۆخێکی بۆ ئامادە کردووم بۆن و بەرامەی شانازیکردن بە خۆمەوە هەڵمژم و لەگەڵ هەر وشەیەکدا کە بۆ ڕێزی ئەو دەینووسم زیاتر هەست بە قەرزی ئەو لە ئەستۆی خۆمدا دەکەم و سەرباریش، ئەو شانازییەی بۆ هێشتوومەتەوە لەو جێیانەدا کە شانازیم هەبێ خۆمی پێ دڵخۆش بکەم ئەوەش ((یەکەم زەوی کە خۆڵەکەی بەر پێستم کەوت))

ئەمەش گوتارێکی ترە کە لە ئاهەنگی لابردنی پەردەی سەر پەیکەرەکەیدا، 29 ـ 11 ـ 1977 لە کۆیە خوێندمەوە:

لە گەرمەی ژیانی سەردەمانەی ئێمەدا کە هەرا و دەنگدانەوەی تەقینەوە و گرمەگرمی لەرزینی ڕووخێنەری تێدا بەرز دەبێتەوە و هەوا بە گەردی ئەتۆمی و دووکەڵی سووتاو پڕ بۆتەوە و چی دی دەنگی تێدا نابیسترێ ئەگەر وەک نەفخی سوور گوێ کەڕ نەکا و ڕووناکایی تێدا فەرق ناکرێ ئەگەر لە بەر بەهێزی چاوان دانەخا، نەوەکانی کورد لە دەنگدانەوەی مێژوویان و پرووسکەی نەبەردییانەوە دەنگی نابیستن گوێ کەڕ بکا و ترووسکەیەک نابینن ئاوی چاو ببا وەک ئەوەی لە ڕەوانبێژی شاعیر و ئەدیب و پێشەوا و زیندووکەرەوەی ڕۆحیان و پێکەری پشکۆیان گرمەگرمی وەک لێدانی چارەنووس دەبیستن و تیشکی وەک تیشکی ئاشکرابوونی یەزدان بەرز بێتەوە، پێش سەدەیەک داپۆشیوون و ئێستاش ویژدانیان دەهەژێنێ و لە خەیاڵیاندا بروسکان دەدا و بەر پێی ئێستایان ڕوون دەکاتەوە و تیرۆژی ڕۆشنایی بەرەو پاشەڕۆژێکی دیاریان دەڕوا.

لە کاتێکدا ئەمە دەڵێم ئاسۆی کورد بە شەفەقی شۆڕش ڕوونە و کەشوهەواکەی بە نرکەی قارەمانێتی پڕ بووە، چونکە ئەمڕۆ لە کاتێکدا شۆڕشەکەی و قارەمانەتییەکەی ناخی دەهەژێنێ، گڕکانێکی دادپەروەری لە ڕۆحی حاجییەوە پەیدا بووە و ڕۆشناییەکی دۆزینەوەی ڕێگای ڕاست ویژدانی ڕووناک کردۆتەوە. لە هەموو مێژوودا لە نموونەی حاجی دەگمەنە کە تەماشای داهاتووی کردبێ و هێنابیەتیە پێش چاوی خۆی و چارەنووس ئارامی کردبێ تا ئەوەی وەک بە زمانی داهاتوو دوابێ و لە (لەوحی مەحفووز)ەوە ئەو وێنەیەی کێشابێ

که قەڵەمی قەزاوقەدەر لە سەر میللەتەکەی ئەو نووسیبێتی. سەیر و سەرسوڕمان لەوەدایە قسەی وەها ڕوون و ئاشکرای لە بارەی ئامانج و چارەنووسەوە کردبێ وەک ئەوەی تەحەددا بێ بە شێوەیەکی جیاواز لەوەی بۆی دیاری کردووە ڕوو بدات و بە لایەکدا بکەوێتەوە کە ئەو خۆی بۆی دانەناوە. هەر دەڵێی ڕۆحی لە پشتی بەردی ئەلحەدەوە لە زەمینی غوربەتدا بە جۆرێ نەهامەتە مێژووییەکانی بە دەستێکی گرتبێ، مەرجەکانی پێشهات دەستەمۆ بکا.

لە بارودۆخێکدا نیم ڕێم هەبێ بەڵگە لە گوتەکانی لە سەر ئەو مەسەلە گەورانە بهێنمەوە کە ڕۆژگار سەلماندوونی چونکە مەلەکردن لە زەریا قووڵەکانیدا و هەوڵدان بۆ گەیشتن بە مەبەستە دوورەکانی کاری لێکۆڵەرەوەیەکی بیندرێژە نەک پەلەپەلی گوتارخوێن. بەڵگەیەکی نێزیکی بەر دەست و چاو بەسە، ئەوەش ئەم جەماوەرەیە کە بۆ یادکردنەوەی دروشمان دەدا و بۆ گلەییەکانی داوای لێبوردن دەکا و بە سۆزەوە ئامێزی پێدا دەکا چونکە پێشبینی ڕوودانی کردووە و لە دوای مردنیدا، وەک ترسێک نەوەکانی دوای خۆی گرتۆتەوە بۆیە بە حەسرەتەوە دەگوترێنەوە و ئاماژەکانی وەک پێشبینی پێغەمبەرایەتی ڕاستەقینە دەبینن و هێزی ڕەوانبێژی و پتەوی باوەڕەکەی لە قسەکانیدا وایان کردووە وشەکانی ببنە ڕووناکایی تێگەیشتن و بۆ ئێمە لە کۆڕی زانیاری کورددا دوای سەدەیەک لە دەربڕینیان، بووە ڕێپیشاندەر و پێمان وابوو جوانترین گەوهەر سینگی ئەو تابلۆیەی برازێنێتەوە کە بەرەو سەکۆی پەیکەرەکەیمان دەبا لە خۆی بخوازرێتەوە. چ جۆگەیەکی مەزنە کە بەرهەمی خۆی پێشکەش بە خۆی دەکرێ!

جگە لە حاجی، خەڵکی تریش قسەیان لە سەر داهاتوو و ئامانج کردووە و هەیانە دیدی لە ڕەوتی ڕووداوەوە نێزیک بووە و هەشیانە لێی دوور کەوتۆتەوە و لایەنگرانی بیانوویان بۆ هێناوەتەوە و داهێنانیان بۆ کردووە. لە ڕیزی ئەوانەدا کە تیری نیشانی پێکاوە و سمیوێتی (حاجی)یە کە هەر خۆی چاوی زەین و ڕۆحی گێڕاوە و هەموو ویژدان و سۆز و هەستی خستوونەتە کار و ئەوانە وایان لێ کردووە بتوانێ هاونەغمەی مێژوو بێ و دوارۆژی گەلەکەی بێنێتە بەر چاو، وەک ئەوەی ئەو ڕۆژە یا ڕۆژی پێشتر بووبێ و لە تێگەیشتنی بووبێتەوە و هەر دەبێ لێی بزانێ. ئەو پێشبینییەی لە ئامێز گرتووە و واژەیەکی لێ دەرهێناوە کە ئەو ڕەنگە دەداتەوە تێیدا ژیابێ و تا ئەو ئاستە گەرمایی دەداتەوە خوێنەرەکانی  دوای حەفتاوشەش ساڵ لە مردنی، ڕوخساری خۆیان لە هەڵاوی وشەکانی دەپارێزن و خۆیان لە چزوویان لادەدەن. زاتی خۆی لە ناو گەلەکەیدا تواندۆتەوە و وەها تێکەڵی بووە وەک گۆشت و خوێنی لێ هاتووە و باوەڕ بکرێ وەک دڵۆپە ئاوێک بە زەریایەکدا پەرت بووبێ و وەک بڵاوبوونەوەی ڕەنگێک لە تابلۆیەکدا. دوای ئەوە چ سەیر نییە قسەکانی لە سەر چارەنووسی کورد وەک ڕاستبوونی مەوداکانی ژیانی خۆی، منداڵی و هەرزەکاری و پیریی ڕاست دەرچن و ئەگەر لێدانی دڵی چەندین سەردەم لە ناو کورددا بەردەوام بێ مافی ئەوەی بە دەست هێناوە هاوبەشی بەشێکی ژیان و ویژدانی هەموو کوردێک بێ بەوەی ژیان و ویژدانی خۆی پێ بەخشیوون.

ئەگەر ئەمڕۆ بژیابایە و لە لامان بمابایەوە، ئەوە نەمریی خۆی دەگوزەراند و لە ڕێی بۆنوبەرامە و هەڵکەوتوویيەوە تەمەنی مرۆڤێک دەژیایەوە.

جەماوەری بەڕێز: گەردنتانم ئازاد کردووە لە سڕینەوەی هەر وشەیەکی کە باسی گەورەیی ئەوم پێی کردبێ و لە سەنگی مەزنایەتیدا هێندەی سەنگی ڕوانینی بۆ پاشەڕۆژ و توانەوەی لە گەڵدا و توانستی نەمرییەتی داشکێنن چونکە شتێکی وای نییە ئەگەر لێی بسێندرێتەوە لە مەزنایەتی بکەوێ، کێشەی ئەو دەستنیشانکردنی داڕشتنێکی وایە خەسڵەتەکانی بشارێتەوە تا ئەوەی لە بارەیەوە دەدوێ لەوە دەرچێ بە لایدا دابشکێنێ. با لە ڕەهەندەکانیدا بواری پێشکەوتنی تری بپێوین کە هەر یەکەیان هەناسەی خۆڕاگر سوار دەکا: زاڵبوونی سروشتی شتەکان وای لێ کردووە لە گۆڕینی داستانی (ئال عوسمان)دا بە سەر کەسێکی وەک ئەحمەد شەوقی و زۆرینەی ئەدیبە عارەب و ناعارەبەکاندا، ئەگەر نەڵێم هەموویان، زاڵ بێ و لە باوەڕ بە زانست و بە درۆخستنەوەی داستاندا پێش (جەمالەددین ئەفغانی) بکەوێتەوە و لە یەکسانیی ژن و پیاودا لە پێش (قاسم ئەمین)دا بێ و نێزیکەی نیو سەدە لە مەسەلەی نەتەوایەتی بەرچاوڕووندا پێش سەردەمی خۆی بکەوێتەوە و ببێتە یەکێ لە پیاوە داهاتووەکان لە کاتێکدا لە ئامێزی ڕابردوودا دەژیا و شیری کتێبی شیکردنەوە و زمانەوانی و باوەڕی دەخواردەوە و سێیەکی تەمەنی جگە لە تارمایی بەربەستی سەدەی نۆزدە هیچی نەدەدی و بە دەگمەنیش هەواڵی دۆستانی دەزانی.

کەسی ئەم سەردەمە کە ڕاهاتووە ئەنجام بە هۆکارەوە گرێ بدا، لە تێگەیشتنی ئەو هێزە بێ سنوورە سەرسام نابێ کە (حاجی)ی وەک دەمی تێغێکی درەوشەدار لە کێلانی ڕابردوو هەڵکێشاوە و لە سبەینێدا ڕادەپەڕێ و بیرێکە بەرەو ئامانج و چارەنووس دەیپەڕێنێتەوە و لە لۆژیکی پێداویستی و لاوازییەوە کەرەسەی هێز و بەردەوامبوونی بۆ بە دەست دێنێ و لامل چەند هەوڵ بدا مەودای دواکەوتن لە نێوان

خۆی و واقیعەکەیدا کەم کاتەوە و دژەکردار لە ناوەڕۆکی گەشەسەندنی لابەرێ ئەو پرسیارە سەرسوڕماوە هەر دەمێنێ کە چۆن هێزی بەربەستی (موتەنەبی) و ڕقبوونەوەی لە مشەخۆری تیایدا کۆ بوونەوە و کام ئاسمان عەشقی دادپەروەریی هەر لە سەرەتای تەمەنەوە کردە دڵیەوە و ئەوەی بە خەڵکی دی نەدا و کام پشت و پەنا ئەو ئازایەتییەی تەنها بەو بەخشی کە چ سنوور و پێشگری نەبێ و دەبێ لە جێیەکەوە کە نەیدەزانی و نایزانین کوێیە خورپەی بۆ هاتبێ کە دەبێتە هەڵبژاردەی قەدەر بۆ تەکاندنی ورەبەردان لە دەماری نەتەوەیەکدا تا لە منداڵییەوە بەرز بێتەوە بە سەر ئەو کەسانەدا کە لاوازییان لێبووردراوە و لە سەر کەمایەتیی ڕاهاتوون و ئاگایان لە هەواڵ و شوێنەوارێ نییە کە لایەقی مەزنیی و پێشڕەوایەتی بن! ئەوە هەموو سەسوڕمانەکە نییە و هەر دەڵێی چارەنووس تەواوەتی بۆ مەرجە گرانەکانی هەڵبژاردنی هەبووە و پەیامبەری نیشتمانپەروەریی کوردی لە ڕێی کەسێکی بێ باب و هەژار و دەربەدەری دابڕاوەوە لە داری خۆی ناردووە و نەوە دوای نەوەش خەڵکی لە وێنەی ئەو دەژین و دەمردن نە شوێنەوارێک جێ دەهێڵن نە هەواڵێک دەورووژێنن و هەندێ لەو کەرەسەی پشتگوێخستنە کە چارەنووس لە ژیانی ئەم مەزنەدا گردی کردوونەتەوە تا لە ناو ڕەوێ لە داهێنەرانی پشتگوێخراو، نەک کەمێکیان، سەراو کەوێ و سەر بە میللەتێکیشە کە لە هەموو میللەتێکی تر تێکشکاوتر و زەرەرمەندترە.. تاریکایی دەوروبەری هەر ئەوەندە کاری تێ کرد ڕووناکتر بێ و لە سەر شانی هاشاکردنەوە و لە ناو پشتگوێ خستنەوە ناوبانگی بڵاو بووەوە و واتاکانی نەمریی لێ دەرکەوتن. خەسڵەتە تایبەتییەکانی، لەگەڵ هەموو بەربەستێکدا، بۆی زیاد کرد و وای لە قەدەر کرد بەرانبەری بەخشندە بێ لە پێدانی پلەوپایە و خۆی لەوانە پاراست کە نەفسی مرۆ لاواز

دەکەن یا لە ناو و ناوبانگ کەم دەکەنەوە و بەو ڕێیەشدا ڕۆچوو کە برسێتی چاوتێرانە و دەربەدەری سەربەرزانە و ئازاری داهێنەرانە لێی جوان بن و وەخت بوو تامی هەموو ئەوانە لە زاریدا شیرین بێ نەک تەنها تامی لایەنی ڕۆحی، تامی نیعمەتی تەڕوبڕیش تا گەیشتە پلەیەکی وەها خۆلادان لە خۆیان و ئیشتیها کردنەوەیان وەک ئەوەی لە ناو جیهانی بە پیتی سیاسەت و لە سەر سەرچاوەی داراییدا بێ و هەر بە قەدەر پێداویستی خۆی لێ هەڵگرێ، وەک ئەو سۆفییەی کە تەقوای دەوێ کاتێ دەڵێ:

لە دەسیسە دەترسم کە برسی بم یاخود تێر بم
چاکبوونەوەی برین خراپەی تێربوونی پێیە

ئەویش لە خۆهەڵناندا بە دەربەدەری و تاککەوتنەوەیەک کە بە سەر سەرجەمدا بەرزی دەکا و دەگاتە باغی پەیامبەرە نەمرەکان، بە بڕوای تەواو و دەروونی بەهێز و هەنگاوی مەحکەمەوە گەرد ناکەوێتە سەر باوەڕەکەی، دەنا نەدەگەیشتە ئەو بەرزییەی کە تیایدا دەڵێ:

هەر منم ئێستە وارسی عیسا
بێ ژن و ماڵ و بێ کوڕ و مەئوا

لە مەودای سەرکەوتندا بە سەر ماددەدا زیاتر ڕۆیی و گەیاندیە ئامانج و کۆتایی و هەموو ئەو ڕەهایانەی تێپەڕاند کە سیاسەتمەداری پێش خۆی پێی گەیشتبوون و ئەوەی بە پەیامە نەتەوەییەکەی بەرەنگاری بووەوە و ڕووبەڕووی مێژوو پێی وەستایەوە و لە پێناوی ئەوەشدا خۆی لە بیر کردبوو، وای لێ کرد تاڵیی ژیانی بە لاوە سووک بێ و دابڕان لە پلە و پایە ئاسان بێ و دەردەسەریی هرس بکا و سواری

ناخۆشترین کەشتی بوو و تاڵترین پێکی هەڵدا و خۆی لە خۆشترین پەیوەندی نێوان مرۆڤ لادا کە هاوسەرگیری و منداڵ و نەوەخستنەوەیە و نیشتمانپەروەریی بۆ خۆی زەوتی کرد و کوردستان بۆ پەیامەکەی خۆی هەڵیبژارد و خۆشیی ماڵ و منداڵی بە ئەوینی نیشتمان و خۆشەویستی نەتەوە گۆڕییەوە و بە فراوانیی ئەبەد و ئەزەلی پێ دان و بازرگانییەکی کرد دەستکەوت لە حیسابیدا بێ بەها بێ و مەترسی بە سەر شتی تردا بشکێتەوە.

ئەی مەلایەکەتی بەخشندە!

سڵاو لە جەستەی دوور و نیگاری ئێرەت، تۆ خۆشەویستی لە ویژدانماندا و شانازیت لە هەستماندا و هەتا هەتا سیمبۆلی شەرەف و نەمریت.

ئەی خوێنەری عارەب، ڕەنگە تا ئێرە شتێک لە پلە و پایەی حاجی قادر، لای قەدرزانان، بە پێی بۆچوونی من، تێگەیشتبیت، باوەڕیش بکە کە هەرسێ بەشەکەی پێشتری (حاجی قادر) کە لە بارەی لێهاتوویی ئەوەوە نیازی تەواوکردنیم هەیە، بەردەوامی و لقوپۆ و بەرزبوونەوەی ئەو دوو نووسینەی لێرە بەپێشەوە نەبێ هیچی تر نییە بەڵام لە بەرگی بەڵگە و دەلیلی باوەڕپێکراودان و کەلێنی نەزاندراویان بۆ گەڕاوم تا ئەوەی لە کتێبەکەدا جێیان بۆتەوە و لە گوتاردا جێیان تەنگە. هەوڵم داوە قەوارەی گەورەیی ئەو مرۆڤە دەگمەنە تێبگەم و خوێنەری کوردی لێ تێبگەیەنم کە چۆن ئەو شۆڕشە ڕۆحییە مەزنە لە سەرچاوەیەکەوە بەرپا بووە کە دەبوو بەر لە هەڵچوونی، بە پێی

بارودۆخی خۆیی و دەوروبەر و ژیاری کۆڵەوارەوە کە بیستوپێنج سەدە زیاتری نەبوونی و دەربەدەرکردن و دابڕان و لەناوبردن کە مێژوو بە سەر کوردیدا داوە، وشک بکا. بەخۆت دەبینی ئەوەی بیەوێ داوێکی ڕەشی وەک ئەوەی لە نووسینەکەی (العراق)ەوە گوازراوەتەوە لەو تیرۆژانەوە بە دەست بێنێ کە لە حاجی قادرەوە هەڵڕژاونەتە ناو ناوەڕۆکی دێڕەکانی منەوە، دەبێ لە تاریکایی ڕۆح و شەوەزەنگی بیری خۆیدا بیهۆنێتەوە و بە لێهاتویی تەڵەکەبازان بیخاتە ئەستۆی قەڵەمی منەوە، وەک ئەوەی ماڵی دزراوی هەتیوان فڕە بداتە حەرەمی کەعبەوە. ڕەنگە جێی خۆی بێ دوای ئەوەی لەو دوو گوتارەی پێشتردا پلەوپایەی حاجی قادر ڕوون بووەوە بێتاوانیی خۆبەخۆی قەڵەمی منیش دەرکەوتبێ لە تۆمەتی وابەستە کردنی ئەدەبی حاجی قادر و کەسێتی خۆی، بە دەرەبەگەوە چونکە بێتاوانی ئەو وەک بێتاوانی خۆرە لە بڵاوکردنەوەی تاریکیدا و ئەگەر بۆت هەڵکەوێ کوردی بخوێنیتەوە دەبینی وەک تێکۆشەرێکی ماندوو و بە درێژایی دەوروبەری هەزار و سەد لاپەڕە سەرقاڵی ئەوەم حاجی قادر لەو تۆمەتانە پاک بکەمەوە کە لە ڕووی بیرەوە سەر بە دەرەبەگ و نادەرەبەگ بووبێ وەک لە هەندێ لاپەڕەدا کە سەرگەرمی لێکدانەوەی چینایەتین هاتووە و دەتبینیم لە شیکردنەوەی چینایەتیدا، جۆرەها بەڵگە دەهێنمەوە بۆ بەدرۆخستنەوەی بۆچوونێک کە تاک دەکاتە پارچەیەکی گوێڕایەڵی ئەو واقیعەی کە گرتوویەتیە خۆی و حوکمی لێ دەخوازێتەوە تا بارودۆخی ماددی زاڵ بکا بە سەر ئیرادە و هەڵسوکەوتی تاکدا. هیوادارم بتوانم بە تەرجەمەی ئەو ململانێیەی کە لە پێناوی دەربازکردنی گەورەیی و قەدر و کەسایەتی ئەودا لە بەرانبەر بۆچوونی ماتریالستی توندڕەودا کردوومە باسەکەت بۆ نێزیک بکەمەوە و پێچەوانەی نەبوونی ڕۆڵی تاک و هەرەسی ئیرادەی بەرانبەر

جەبەرووتی واقیع بسەلمێنم. لە لاپەڕە 20ی بەشی سێیەمی کتێبی (حاجی قادر)دا، دوای هەندێ دەربڕینی بەهێز بۆ بەپیرۆزدانان و شیرینکردن و بەرزڕاگرتنی ڕاستی بەرانبەر بابەتی هەڵبەستراو، گوتوومە:

"پێم بڵێ نووسەرێکی کوردی بێ سامانی کەمدەسەڵات کە ناتوانێ چەنگەوبازی باسەکانی جیهانیی ببێت و لە چارچێوەی خانە وێرانە تەسک و تاریکەکەی خۆی دەرچێت، چی لە بەردەستدا هەیە شانازی پێوە بکات لە دروستبینیی و ڕاستبێژیی بەولاوە؟ کە هات و ئەو هەندە هۆیەی کەیفبەخۆ هاتنیشی کردە قوربانی بڕیارە فەلسەفیەکانی حازربەدەست و خۆسەپێن، دەبێ دڵی خۆی تەسکین کات بەو جۆرە شانازییەی کە جاران عەبدە وەفادارەکان لە کاتی پێ ماچکردنی خاوەنە شەرعییەکانیاندا سەری خۆیان پێ بەرز دەکردەوە! من بێم حاجی قادر لە تۆقەڵەی شەرافەتی گەردەنفیرازی خۆیەوە بێنمە بەر پێڵاوی ئەو برا گەورانەی کە خۆی لەوان بە پێشەوە دەگرت، لە بەر خاتری ڕەشایی چاوی ئەو تەسەوورانەی کە شەیدای کڕنووشبردنی (تاک)ن بۆ شکۆی (واقیع) دەبمە جەلادێکی بەکرێگیراو بۆ پەڕاندنی سەری قارەمانێک. کە ئەمەشم کرد لەگەڵ حاجی قادردا دەبێ ئابڕووی هەموو ئەو ئابڕوودارانەش ببەم کە بە پێوانە و کێشانەی دڵگەرمێکی ئەمڕۆ، لە بەر تیشکی نیگا لێڵەکەیدا، نابێ ئابڕوویان هەبووبێ! لەوەندەش نەوەستم: هەرچی مێژوو هەیە سەرەوبنی بکەم بۆ بەر حوکمی ئەو تەسەوورانەیی کە گەردەنی حاجی قادریان پێ پەڕاندم و ئابڕووی ئابڕوودارانیان پێ تکاندم! نەخێر ئەمە ناکەم!!!".[i]

"ئابڕووی حاجی قادرێک نابەم کە ئابڕووی هاوچەرخانی خۆی کڕیوەتەوە بەوەدا یەکە و تەنها لە جیاتی ئەوانیش پێکۆڵی لە واقیع کردووە، سەری بۆ دانەنواندووە!"

"من لەگەڵ حاجی قادرێکی ڕاست و دروستدا خەریکم، تارماییەکەی بە ناو واقیعێکی بێ فێڵدا دەگێڕم. گوتە و کردەی لێ هەڵدەگرمەوە بێ دەسکاری: هەر شەوقێکیش لە باسی ئەوەوە بەملا و بەولادا پڕژا تێیرا دەڕۆم تا ئەو مەودایەی پێی ڕووناک بۆتەوە. ئەگەر هێزی هەست و پێزانینم یارمەتیم بدات دەلالەتی گوتە و کردارەکانی دەکەم بەو تیشکەی کە مرۆڤ و واقیع و ڕووداوی ڕۆژگاری ئەوی پێ بناسرێتەوە، لەو ڕووەوە کە حاجی لێی دەوەشێتەوە بە نموونەی ڕاستگۆیی و ڕاسترۆیی ئەو سەردەمە حیساب بکرێ و هەڵوەستەکانی بەرانبەر کەسان و ڕووداوانی ڕۆژگاری خۆی بە شایەدی ڕەوا و باوەڕپێکراو وەربگیرێن و دە جاران پتر تەرجیح بدرێن بە سەر لێکدانەوەی لایەنگیرانەی وەیا نەشارەزایانەی نووسەرێکی ئەم ڕۆژگارەدا..."[1]

ئەوانە هەندێ نموونەی خاوێنڕاگرتنی حاجین لەوەی پاشکۆی کەس بووبێ و هەر سێ بەشی کتێبەکە و دەیانی تری ئاوهای تێدان کە لە باسی پاکژی و پیرۆزیدا لەوانەش بەرەژوورترن و بە بێ شایەد و بەڵگەی بەهێزی سەپاندن قسەیان لێ ناکرێ. ئەگەر ئەو وێنانە، بە قسەی ئەو گوتارەی کە لە (العراق)دا بڵاو کراوەتەوە، سووربوون بن لە سەر بە پاشکۆکردنی حاجی و کردنی بە ئاوازخوێنی ئاهەنگی

[1] لە لاپەڕە 21ی بەشی سێیەمی (حاجی قادری کۆیی)یەوە گوازراوەتەوە. (وەرگێڕ).

دەرەبەگ، من وەک کەسێک کە باوەڕم بە کەرامەتی مرۆڤ هەیە، هیواخوازم سەرجەمی مرۆڤایەتی بە بێ ڕیزپەڕ ببنە خزمەتکاری وەک حاجی و لە شوێنپێی شانازی بەخۆکردنی ئەوەوە هەنگاو بنێن و لە زەلیلی و بێدەنگبوون بەرزتر بن و خۆزگە سەرجەمی نووسەران بە شێوازی من لە ڕابردوویان بکۆڵیایەتەوە تا ڕاستیەکان، بە چاک و خراپەوە و بێ زیادکردن و لێلادان بەدەست بێنن و بە ڕیز تا هەنووکەیان کە ئارایش ڕوخساری ناگۆڕێ، پێیدا بهاتنایەتە خوارێ و بە دوای هەقێکدا بگەڕابان ئەگەر نەبێ تێربوون و ماڵ و جلوبەرگ جێی شەرەفی تێدا ناگرنەوە و گومانم هەیە بە بێ ئەو هەقە شەرەفیش بوونی هەبێ.

من حاجی قادر لە ناو هاوکوفانی خۆیدا وا دەبینم کە گەورەیی و سووربوونی لە سەر ڕای خۆی و گوێنەدانی بە پێداویستییەکانی ژیان، ڕێخۆشکەر بن بۆ ئەوەی لەو تیۆرییانە ورد ببمەوە کە بە سەرشۆڕکردنی تاک بەرانبەر پێداویستی ماددی گەشە دەکەن و نەهێشتنی ئیرادەی تاک جوانیان دەکا، تا یاسا ڕەهاکانی بە درۆ بخەمەوە و بەرپەرچی هۆکاری شانازیکردنی ئەوانە بدەمەوە کە شانازی لەوەدا دەبیننەوە مرۆ پاشکۆی شتی دەرەوەی ئیرادەی خۆی بێ کە دەبوو شینی بۆ بگێڕن. نایەوێ ئازارێکی لەوە گەورەتر بە چارەنووسی مرۆ بگا کە لە سەپاندنی ئەو کۆیلایەتییە گەورەتر بێ کە پێداویستییەکانی ژیان لە دەرەوەی بوونی خۆیەوە بە سەریدا هێناوە و ڕەنگە هەموو نەخۆشییە کۆمەڵایەتییەکان لە بەین بچن و جەنگ و کۆلۆنیالکردن و چەوساندنەوە پێ بە پێی پێشکەوتنی مرۆڤ بەرتەسک ببنەوە، بەڵام ئەگەر کۆیلایەتی بۆ ماددە بە سەر ویستیدا زاڵ بێ ئیدی دەسبەرداری نابێ. شیکەرەوان و بیانووهێنەران، کاتێ هاتن

مێژووەکەیان بە شێوەی ماددی بە سەر خۆی و هەرچییەکی کە ئەنجامی داوە سەپاند، چەند هەوڵ بدەن لەو ئەنجامگیرییە دەربازی بکەن لەو مرۆڤە نابێتەوە کە کەوتۆتە بەر تیۆرییەکانیان چونکە کاتێ گوتیان بە پەرەسەندنی کەرەسەی بەرهەمهێنان پەیوەندی بەرهەم دەگۆڕێ و بە دووی ئەوەشدا گۆڕانکاری بە سەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و هەرچی شێوازی ژیان و باوەڕێک هەیە دێ، ڕاستیەکانیان ئاوەژە کردەوە و وەک پەلەوەر ناقرگەی مرۆیان گرتووە و ناچاریان کردووە وەک ڕیخەڵۆکە کوێرە پێوەی بێ و بەردەوام چاودێریی ویستەکانی دەکەن تا ڕەتیان بکەنەوە. ئەوانە ئەو ئامێرەیان کردۆتە ئاغای بەشەر کە بە دەستی خۆی و ویستی خۆی دروستی کردووە و لە بەرژەوەندی خۆیدا بەکاری دێنێ و ڕێشی تێدەچێ وەک شتێکی سووک بیهاوێتە پەنایەکەوە و هەوڵ دەدا لەوە چاکتر دروست بکا و دوای ئەوە یاسای گونجاو بۆ بەکارهێنان و کڕین و فرۆشتنی دادەنێ. ئا ئەم ئامێرە گوێڕایەڵەی دەستی مرۆ و سووک لە بەرانبەری هیممەتیدا دەکەنە ئاغای دەسەڵاتدار و پاڵپێوەنەری بەرەو ڕێی ژیان و باوەڕ و دابونەریت وەک ئەوەی بەرەوڕووی مرۆ گڤ بووبێتەوە و سووکایەتی بە ئیرادە و کەرامەتی بکا و خۆی بە دەستی خۆی، خۆی خەلق کردبێ یا لە مەڕیخەوە بە دروستکراوی و یاسای کارکردنیەوە هاتبێ تا ڕدێنی مرۆ بگرێ و بەرەو چارەنووسی دیاریکراوی بڕیاربۆدراوی ماددەی مردوو ڕایکێشێ. ئەو تیۆرییانەی کە ئیرادەی مرۆ ڕەت دەکەنەوە لە پێکەنین کەمتریان پێ دەوێ، چونکە ئەگەر هەوجاڕ جووتیار و وەرزێر و ئاسنگەر و ئەوانە ڕاکێشێ کە لە کڕین و فرۆشتندا کاریان لەگەڵ ئەو کەسانەدایە، دەبێ حەیوانی سەربڕاو فەرمانڕەوا بێ بەسەر قەسابەوە و شەرەفی هەڵگەڕان بە ئەڤرێستدا بۆ پاچ و پەت و قولاب بگەڕێتەوە نەک ئەو کەسەی پێیدا سەردەکەوێ

و له هەموو گەمەیەکدا کە سەرکەوتنی بە دوودا بێ، دەبێ خەڵات بە تەختەی شەترەنج و ئالەتەکانی بدرێ و نازانین دۆڕاو چۆن دەستنیشان دەکرێ... ئەم داگەڕانە بەرەو خوارە بەرەو ئەوەم دەبا بڵێم پەرەسەندی نووسەر بەوە دەبێ قەڵەم پەرە بسێنێ لە خەڵووزەوە بۆ پارکەر. دڵنیام ئەگەر بشێ ئەم قسە خوارانە بە سەر بیری خەڵکدا بسەپێندرێن تا بەڵگە بدۆزنەوە و فێڵ لە خەیاڵ بکەن، دەبێتە هۆی دڵخۆشی ئەوانەی مادده بە سەر ویستی مرۆدا سوار دەکەن چونکە نەمریی و یەکتایی هەمیشەیی بۆ داس و داو و دەرزی لە دیاریکردنی چارەنووسی مرۆڤدا هەیە. چەند خۆشە شیر ئاغای بێریوان بێ و پینەدۆز کۆیلەی پێڵاو بێ و گۆڕانی دیرەگی بنمیچ بۆ کۆنکریتی شیشدار دەست بە سەر باوەڕ و نەریت و کەلەپووردا بگرێ و لەوەش خۆشتر ئەوەیە جیابوونەوەی هەندێ پارچەی وڵات لە سەرجەمی وڵاتەکە و چوونی بۆ ناو وڵاتێکی تر ببێتە هۆی ئاسانکاری دەباغکردنی پێست.

ئەم خەیاڵانە و شتی وەک ئەوانە ئەو کاتە لەخۆڕا دێن کە بڵێین حاجی قادر کۆیلەی دەوروبەری خۆی نەبووە و بە پێی بەرژەوەندییەکانی ڕەفتاری نەکردووە چونکە هۆشی لاوی کورد پڕە لە باوەڕی پێچەوانە و بەرەنگاربوونەوەی ئەوەش کە دژی باوەڕیانە بێ سوودە و دوای ئەوە باشتر وایە بەوە وابەستە بێ کە بە سەریدا دراوە و بە هۆی بەردەوامی و دووبارەکردنەوەوە لە هۆشیدا سەپاوە با بەڵگە و بورهانیش هەبن و دیارە وا ئامادە کراون عەقڵی ئەلکترۆنی و بیرکاریش بە درۆ بخاتەوە تا ئەو دینە نوێیە بپارێزێ لە هۆشی بەئاگایدا سەپاوە و جێگیر بووە. بەڵام ئەوە بەرپەرچی ئەوە نییە بەڵگەی سەپاندن و ڕەتکردنەوە بخەمە سەر تای ئەرێتی و نەرێتی

هەر باسێکی لە سەر سەکۆی لێکۆڵینەوە لە سەر حاجی بە قەڵەممدا دێ و پێم وایە جۆرەها ڕا و بۆچوونم لەم بارەیەوە خستوونەتە ڕوو کە پێش من لە بواری ڕۆشنبیری کوردیدا نەگوتراون و ئەوەش لە بواری ڕۆشنبیرییەکدا کە جگە لە ڕێیەک، کە شیکردنەوەی چینایەتی بۆ مێژووی لێوە هەڵدێ و بە پێی سستەمێکی حیسابکراوی ئەزەلی نەمانی چینایەتی تێدا ئاوا دەبێ، هەموو ڕێیەک لە ڕێبوارانی داخرابێ سەیر نییە.

سووربوونم لە سەر گوتنەوەی قسان لە پاکژڕاگرتنی حاجی لە هەموو دەرفەتێکدا کە بوار هەبێ، لە حەقیقەتێکی گەورە و گرنگی حاجی قادرەوەیە کە لە هەر نووسراوێکدا بڵاو بووبێتەوە ئاوڕی لێ نەدراوەتەوە تا ئەو ڕۆژەی دەستم بە نووسین و لێکۆڵینەوە کرد لە بارەیەوە، ئەو ڕاستییەی بەر چاوم کە دەربەستی تیۆری دەقگرتوو نییە و لە زەینمدا بە شێوازی باو داناکەوێ و بەوانەوە سەرقاڵ نابێ کە بەر لە باسکردنی پێ دەچێ بە فراوانیی زانراو بێ. ئەگەر بۆ نموونە، گوتت هاروونی ڕەشید یەکێ بووە لە خەلیفە عەبباسییەکان و فەرمانی ئیعدامکردنی بەرمەکییەکانی دەرکردووە، شتێک دەڵێی کە پێویست بە گوتن ناکا، لە بارەی حاجیشەوە ئەگەر گوتت نیشتمانپەروەر بوو و گەلی خۆی خۆشدەویست و عاشقی کوردستان بوو، ناگەیتە ناوقەدی ئەو پەیکەرەی کە لەو بوارەدا بە شیعرەکانی دروستی کردووە و پەنابردنیش بۆ لێکدانەوەی چینایەتی بۆ ئاشکراکردنی هیچ نهێنییەک لەوانەی حاجی لە سەردەمی خۆیدا بە لایاندا چووە وەک بابەتی نەتەوایەتی و چینایەتی و کاریگەریی تردا سوودی نابێ و دەبێ خەسڵەتی بەهێزی تایبەتمەندی حاجی خۆی هەبووبن کە وایان لێ کردووە هەڵسوکەوتی لە خەڵکی دی جیا بێ و بە شێوەیەک

وورووژاندبێتی کەسی سەردەمی ئەو بەو شێوەیە نەورووژابێ. لە ڕەفتاری ڕێکوپێکی، لەو سەردەمەوە کە لە کۆیە منداڵێکی بێ باب بووە تا ئەو ڕۆژەی لە ئیستەنبوڵ سەری ناوەتەوە، ئەوەم ئاشکرا کردووە کە نەفسی بەرز بووە و ڕێ نەبووە ئەو هەستەی لە ڕێی پەروەردەوە بۆ هاتبێ بەڵکو وەک بەشێکی ماددی لەگەڵیدا بووە چونکە دەوروبەرەکەی و ئەوانەی بە منداڵی و هەرزەکاری بەخێویان کردووە و لە هەموو ئەو دەمانەدا کە مرۆ ڕەوشت و پەروەردە وەردەگرێ چ زادێکی ماددی و دەروونی نەبووە تا هەستی سەروەری و شانازی پێ ببەخشێ. ئەگەر ئەو گیانی شانازی و نەفسبەرزییەی حاجی وەرگیراو و دەستکرد بوایەن نەک ڕەگداکوتاو و لکاو، بەردەوامیی کێشەکانی ژیان هەموو ئەوانەی لێ دەتەکاندن کە هی خۆی نەبوون و دەشزانین کە یەتیمی و دەربەدەری لە سەرەتای منداڵیدا ئاسان نەبووە تا ڕێی نەفسبەرزی و گەورەیی و ڕەوشتی باڵای پێ ببەخشن.

ئەو شانازییەی ئەو، بۆ هەموو تەمەنی، کلیلی کەسایەتی و ڕوونکەرەوەی ڕەوشتێتی و هیچ پێوەرێکی دی ئاوها لایەنەکانی ڕوون ناکاتەوە. بۆچوونی من لەوەدا ڕاست دەرچوو کە لە هەندێ بابەتی بەشی سێیەمی کتێبەکەمدا گوتوومە کە حاجی قادر هەتا مرد، بەردەوامیی منداڵییەکەی خۆی بوو. هەرگیز چاوی لە ڕابردووی خۆی دانەخستووە و لە هیچ پەیوەندییەکی ژیوان نەبۆتەوە کە لەگەڵ خەڵکدا دایمەزراندبێ و بەرانبەر چاکە ڕووی وەرنەگێڕاوە و لە هیچ هەڵوێستێک پاشگەز نەبۆتەوە و ئەگەر خاوەنی هەق بووبێ لە هیچ کەس نەترساوە و بەڵگەنەوسیستیشە کە دەستی لە کەس پان نەکردۆتەوە. گوتیشم کە حاجی بە درێژایی تەمەنی، سوور بوو لەسەر ئەوەی کە حاجییە ئەوەش وەک منداڵی نێرینە کە پلە بە پلە

نیشانەکانی لێ دەردەکەون وەک گڕیی دەنگی و مووی دەمووچاوی و پێگەیشتنی نێرایەتی، بە درێژایی تەمەنی یەک هەنگاوی نەنا ئەگەر هاوشێوەی هەنگاوی پێشتری نەبووبێ لەگەڵ دڵنیایی زیاتر بۆ ئەو هەنگاوە و ئەوەی پاشتری، جگە لە زیادکردنی کاریگەرییەکەی. چەندین جار لەو بارەیەوە ڕووی دەمم لە خوێنەری کورد کردووە و سەرنجیانم بۆی ڕاکێشاوە و بە پێی شوێنی ئاخاوتن شێوەی داڕشتن و وێنەم گۆڕیوە و دڵنیام کردوونە کە تێگەیشتنی حاجی بە بێ ئەو تەوەرەی لە کاتی دروستبوون و پەرەسەندن و فێربوون و دەربەدەری و ئاخاوتن و شیعر و کرداریدا بە دەوریدا سووڕاوەتەوە مەحاڵە. هەستی بە جۆشی و بەرزیی نەفسی خۆی، هەر لە سەرەتای کرانەوەی هۆشیەوە، خێرا بەرەو ڕاستگۆیی بردیان و لە سەر شێوازێک ڕایانگرت و قسەی کەسێکیان پێ کرد کە باوەڕی بە خۆی بێ و ئەو توانایەیان پێ دا داوای مەحاڵ بکا و بەرانبەر زەحمەت بوەستێتەوە و بەردەوامی بە بەخشندەیی و خۆڕاگری بدا تا دەست پان نەکاتەوە و ئەوەش هەمان ئەو هەستەیە کە لە ڕووی نەتەوەییەوە، لە یەکەم بەرەبەیانی پەیدابوونیەوە لە خەیاڵیدا هەڵکشا و پێشتریش پارچەیەک بوو لە دژایەتیکردنی شەعبەدەبازی (شەعوەزە) بە ناوی ئایینەوە کە پێشتر هەرگیز کوردستان شتی وەهای بە خۆیەوە نەدیبوو. هەر لەو ڕوانگەیەوە تێدەگەین بۆچی حاجی ژن و ماڵی پێکەوە نەنا. ئاخر شتێکی وا بە دەستیەوە نەبوو مەسرەفی ژنهێنان و خێزان و منداڵی پێ بکێشێ و نەفسە بەرزەکەشی ڕێی نەداوە لەو بوارەدا پشت بە خەڵکی دی ببەستێ و بە دڵنیاییەوە لەو ڕۆژەدا دەرگایەکی لێ دەکرایەوە بەڵام ئەو، ناخۆشترین بارودۆخی لە بەر چاو گرتووە. ئەوەی کە لە یەکەم ڕاماندا لە بارودۆخی ژیانی دێتە بەر زەین گوایە بە تەنها ئەو وا بووە، لە چەند لایەکەوە بەرپەرچ دەدرێتەوە چونکە پێش حاجی و

له سەردەمی حاجی و دوای ئەویش خەڵکی تر ژیاون کە لە هەبووندا پێی گەیشتوون یا لە نەبووندا دابەزیونەتە بارودۆخی ناخۆشتر و دڵەڕاوکێی نەبوون لە ژنهێناندا نەبۆتە بەربەست. جگە لەوەش، نەفسە بەرزەکەی لە هەموو بوارەکانی ژیاندا ئازاد کردبوو نەک تەنها لە بواری ژنهێناندا و لە بەر ڕۆشنایی گەورەیی بەرانبەر هەرچییەکی سووکایەتیی بووبێ. ئەویش وەک هەموو خەلقەندەکانی خوا، ئەگەر بیویستبا دەیتوانی لەو زیادەڕۆییە بێتە خوارێ و سوود لە تواناکانی خۆی وەرگرێ لە سنووری ڕێز لەخۆگرتنی باودا باری سەر شانی خۆی سووک بکا، نەک هەر ئەوە، ئەگەر هەڵوێستی بەرانبەر بە ڕووداوەکان بێلایەنانە بوایە و زمانی لە کەلانی بێدەنگی دەرنەهێنایە کە لەوەدا لۆمەشی نەدەکرا، نیعمەتی زۆر لەوانە زیاتری بۆ دەهاتن کە بە دوای دەسکەوتی دنیادا هەناسەبڕکەیانە. لە بەر ڕۆشنایی ئەو شانازییەدا دەروازەی تر لە ژیانیدا دەکرێنەوە و وا نەبوایە وێنەکان ڕوون نەدەبوونەوە و لێکدانەوەی ئارامبەخشیان هەڵنەدەگرت. سەیر ئەوەیە کە حاجی ماوەی بیست ساڵی تەمەنی شاعیرێتی لە وڵاتی خۆیدا، لە کوردستانی عیراق و ئێراندا ماوەتەوە و ئەوەندەی لە بارەی ئەو کەسایەتیانەی هەردوو ناوچەکە نەگوتووە کە شایستەی پێداگوتن بوون، شیاوی باسکردن بێ و ئەوەش دەماودەم هاتووە کە ڕێزێکی زۆریان لێی گرتووە و پلە و پایەیان بۆ داناوە، تا ئەوەی لە کوردستان دەرچوو و بە غەریبی کەوتە ئیستەنبوڵەوە و لە ناوچە و گوزەرانی ئەو چاکەکارانە دوور کەوتەوە ئەوجا کەوتە باسکردنی چاکەیان و ناوی بەرز کردنەوە و بە مەردایەتی و پاکی و جوانیاندا هەڵیدا و کردیانیە لاپەڕەیەکی پرشنگدار بۆ ڕەسەنایەتی گەلەکەی و لە شیعرەکانیدا پەیوەندی بەهێزی لە نێوان دەرکەوتنی مەردایەتی ئەو ناودارانە و خەسڵەتە شانازیئامێزەکانی نەتەوەی کورد تا ژیانی سەربەرزانەی پێ

ڕەوا ببیندرێ دروست کرد. ئەوجا سەرسوڕمان لەو بێدەنگییەدا نوێ دەبێتەوە کە بەرانبەر بنەماڵەی بەدرخان نواندی کە سەرکردەی شۆڕشی ناوەڕاستی 1800ەکانی کورد بوون لە کوردستانی تورکیادا و ماوەی سیی ساڵیش لە ئیستەنبوڵ هاودەمیان بوو و ئەوەش هەموو تەمەنی ئاوارەییەکەی بوو و ئەو ماوەیە پەروەردەکاری لاوانیان بوو و مامۆستایان بوو و جێگای باوەڕیان بوو، لە یەک بەیتدا نەبێ کە لە شیعرێکدا بۆ مەدحی تەنها شاعیری نەتەوەیی (ئەحمەدی خانی)ی گوتووە، باسی چاکەی نەکردوون. لە سەروبەندی پێگەیشتنی و کرانەوەی هۆشیدا بەرانبەر بە بەها نەتەوەییەکان، مەودای پێداهەڵدان و شانازی بەدرخانیەکان بۆ ئەوانە بەجێ هێشتووە کە شاسواری ئەو بوارە بوونە و لە بەری ئەوان مەدحی ئەو هەڵکەوتوو و سەرکردانەی کردووە کە لێیەوە دوور بوون و لێیان دابڕابوو و بیانووی ئەوە نامێنێ ناوەڕۆکی نەتەوایەتی پێشێل بکا. ڕەنگە حاجی تاکە کەسی ناو ئەدیبان و شاعیران بووبێ ئەو خەسڵەتەی هەبووە بە کەسانی نێزیکیدا هەڵنەگوتبێ و بۆ کەسانی دووریش زیادەڕۆیی نەکردبێ. ئەوەش لە بەخۆنازینەوە سەرچاوەی گرتووە و لەوە گەورەتری کردووە گومانی لێ بکرێ و ملی کەچ بکا و مەودای نێوان خۆی و گومانی دەستپانکردنەوە بە گوێرەی ئەو نەفسبەرزییە بەرین بکا و چاودێرێکی هەمیشەیی لە دەروونی خۆیەوە بە سەر ڕەفتار و هەڵسوکەوتیەوە هەبووە و باوەڕ ناکەم بەندیوانێک ئەرکی بەرتەسککردنەوەی ژیانی بەندکراو بێ، لە نەفسی حاجی توندوتیژتر بێ بەرانبەر بە خۆی. کە ئەوەش زاندرا، ئیدی ئەو نهێنییە ئاشکرا دەبێ بۆچی نەریتی باوی پێداهەڵدانی گۆڕیوە و بەوانەیدا گوتووە کە لێیەوە دوور بوونە و کەس لە خەیاڵیشدا بۆ ئەوە ناچێ لە بەرانبەردا دەستکەوتی هەبووبێ. ئەگەر ئەو نەفسبەرزیەت لە لێکدانەوەی ڕەفتاری حاجیدا لە بیر بچێ،

قووڵبوونەوە و لێکدانەوەت لە بارەیەوە ئاوەژوو دەردەچێ و کە هەندێ لە نووسەران لێکدانەوەی ماددییان بۆ مێژوو هەیە و ویستیان ڕێ و جێی حاجی لە چوارچێوەی فەلسەفەکەیاندا بدۆزنەوە، بە ئەنجامێکی زۆر سەیر گەیشتن کە پێچەوانەی هەموو ئەو حەقیقەت و ڕاستییانەیە کە بە ڕوونیی لە شیعرەکانی خۆیدا دەربڕدراون و وەک ئەوەی لێ هاتووە کافرەکان، لە کاتی هیجرەتی پێغەمبەردا (دروودی خوای لێ بێ) بۆ مەدینە، لە سەر ئەوە ئازاریان دابێ کە پەیامەکەی ڕانەگەیاندبێ. لەوەش سەیرتر ڕازیبوونی نووسەرە لە خۆی و ڕازیبوونی خوێنەرانە لەو نووسەرە، ئەوەش بۆ ڕێکەوتنێکی ڕووکەشانەی ئاشکرا کە لە سەر کاغەزەکە هەستی پێ دەکرێ لە نێوان پێداویستییەکانی حوکمی گردەبڕی ئەو تیۆرییەی لە شیکردنەوە و لێکدانەوەدا پشتی پێ بەستووە و ئەو شتانەی کە دەبوو بێنە دی و ئەو حوکمەش ڕاست دەرچێ کە لە سەرجەمی وێناکردنی حاجی و سەردەم و کۆمەڵگاکەیدا دیاری کردووە. بەم بۆنەیەوە نوکتەیەکم بیر کەوتەوە کە دەڵێ کیژێک ئەزموونی بەڕێوەبردنی ماڵی نەبوو، دوای مێردکردنی بە پێی ڕێنمایی کتێب خۆراکی لێنا و کە مێردەکەی لێی خوارد، گوتی ئەم ژەقنەبووتە چییە لێت ناوە؟ ئەویش بە سەرسوڕمانەوە گوتی: کە کتێبەکە دەڵێ بەتامە، چۆن تۆ حەزی لێ ناکەیت؟!

لە سەرگوزەشتەی حاجی و هەڵوێست و خەمەکانیدا شتگەلێ هەن وەختە سەراپای تابلۆی ژیانی بگرنەوە و لە هەستی بەجۆشیەوە بۆ سەربەرزی و گەورەیی و ڕێزلەخۆگرتن کە بە سەر هەموو شتێکی تردا زاڵی کردبوون کە لەم ژیان و خۆشییەکانیدا هەن و بەوەش بۆتە تەوەری پێچەوانە بۆ شیکردنەوەی ماددی و ئەو بەرژەوەندییانەی کە بۆ توانەوەی تاک لە واقیع و بارودۆخ و بەرژەوەندیدا باڵادەستن و

ئەوەی لە حاجی قادر بکۆڵێتەوە، ئەگەر دەسبەرداری شیکردنەوەی ماددی و چینایەتی نەبێ و بۆ کەسایەتی حاجی و ئارەزوو و ویست و بنەماکانی نەگەڕێتەوە، نە توێکڵێک لە زەریاکەیدا بە دەست دەهێنێ نە گەوهەر و مەرجان. ئەگەر درێژکردنەوەی باس و لێکدانەوە لە سەر ئەو لاپەڕە دوور نەبوایە لە کرۆکی ئەو ڕاستیانەی دەوری حاجییەوە کە بە تان و پۆیانەوە دەیلێم زۆرم دەگوت، بەڵام لە سەرمە ئەو هۆکارە ڕوون بکەمەوە بۆچی ئەوەم ڕەت کردۆتەوە کە حاجی لە ژیانی شاعیرانەی خۆیدا لە کوردستان و پێش چوونی بۆ ئەستانە شیعری پێداهەڵدانی نەبووبێ، من گوتوومە هەر ئەوەتا ئەو جۆرە شیعرەی گوتووە نەک نەیگوتووە. ئەو ڕیزپەڕەش ئەوەیە شیعرێکی پێداهەڵدانی لە پێنج بەیتدا هەیە کە لە ڕووی داڕشتن و خەیاڵەوە یەکێکە لە بەهێزترین شیعری پێداهەڵدان لە ئەدەبی کوردیدا و بە (ئەمین ئاغای حەوێزی)دا گوتوویەتی کە سەرمەشقی پیاوماقووڵانی ئەو دەمەی کۆیە بووە. ڕاستیش شانبەشانی دیدی بینەران بوو تا ئەو ئاستەی پێیان وابێ ئەو پارچە شیعرە لە غەریبییەکەی حاجیدا، لە ئیستەنبووڵ نووسرابێ و هۆی ئەو گومانەشیان ئەوەیە تەماشای ڕووکەشیان لە پێداگوتنەکانی حاجیدا کردووە کە لە غوربەتەوە گوتوونی و ناردوویانیەتی بۆ ئەوانەی لە سەریان گوتراون و وەک یادگاری و وریاکردنەوە و لە ڕووی سۆزەوە بۆ هاونیشتمانییەکانی و کەسوکار و خۆشەویستانی لە کوردستان ناردوونی. وردبینیم لە لێکدانەوەی واتای ئەو پێنج بەیتە و شێوەی داڕشتنیان و بە بەراوردکردنیان لەگەڵ ئەوانەی پێشتریدا کە لە سەردەمە جیاوازەکانی ژیانیدا نووسیونی و چی لەگەڵیاندا دەگونجێ و چی ناگونجێ، ڕێی بۆ خۆش کردم تا ئەندازەی یەقین کە بەرپەرچ نادرێتەوە و بە هەندێ ئەنجام بگەم کە هەموویانم لە جێی خۆیاندا، لە بەرگی دووەمی

کتێبەکەم باسم کردووە و کورتییەکەی ئەوەیە کە حاجی ئەو شیعرەی لە کاتی فەقێتیدا، لە باڵەک، لە خاکی کوردستانی ئێراندا داناوە و هەموو ئەوانەش پێش چوونی بۆ ئیستەنبووڵ ڕوویانداوە و زۆر ڕێی تێ دەچێ لە گەڕانەوەدا بۆ کۆیێ دەسکاری کردبێ چونکە لە بەیتی ناوەڕاستدا دەڵێ دوو بەیتی دواتر دیاری و توحفەیە لە سەر نەریتی ئەوانەی لە سەفەر، بۆ خاکی وڵات دەگەڕێنەوە و بەهایان لە سەد گەوهەری بەهادار زیاترە. بەوەدا دڵنیا دەبین کە ئەو بەیتانە لە کاتی گەڕانەوەی حاجیدا بۆ کۆیێ گوتراون، دوای غەریبییەکی دوور و درێژ، ئەوەش جێی ئەوە ناهێڵێ لە دوورەوە نێردرابن چونکە ئەوە لەگەڵ ڕوونیی بەیتەکاندا یەک ناگرێتەوە کە حاجی گەڕاوەتەوە و دیاری پێ بووە.

ئەو پێنج بەیتە، بە هۆی ئەو زەحمەتییە ڕووکەشییەوە کە دەبێ لە جێی دیاریکراوی خۆی، لە حەساری نەفسی بەرزی حاجی دابندرێ، یەکجار زۆر سەرقاڵی کردم و نەدەبوو وەک ئەوانەی سەرقاڵی لێکدانەوەی حازربەدەستن و چاوەڕوانی ڕووداو دەکەن تا لە قاڵبی بدەن یا قاڵبەکەی بۆ بگونجێنن، بە چاوی نزمەوە تەماشای فکر و بۆچوون و بابەتەکە بکەم. ئەوانە وەک ئەوەی دەروێشی باوەڕ بن بۆ نهێنی زانینی شێخی تەریقەت دنیا وەک کەر ڕێشمە دەکەن تا کەشفەکانی بە ڕاست بگەڕێن. سروشتم لەوەدا پێش خۆم کەوتووە هەموو شتێک وەک هەیە هەڵسەنگێنم و ئەگەر هەوڵەکەم سەری نەگرت بێ توانایی خۆم بە ئاشکرا ڕادەگەیەنم[1]. هەموو توانای هۆشی

---

[1] . بۆ نموونە دەڵێم چەند ساڵێکە و هەتا ئێستاش لەوە سەرسامم چۆن دژەبەر لەمەدا لادەبرێ: بە نووسین و قسان، هەمووان لەوەدا یەکڕان کە یەکێ لە ناودارانی بنەماڵەی بەدرخان خیانەتی لە مەسەلەی کورد کردووە ، ئەویش (عەزەددین شێر)

خۆم لەو بەیتانەدا تاقی کردۆتەوە و ڕامام تا لە سەرچاوەی دڵنیا بم ئەوەش بە کۆکردنەوەی هەرچی لە بارەی شیعر و هەواڵ و سروشتی حاجی و حاجی خۆیەوە زاندراوە و مەسەلەکەم بۆ توندترین ئیحتمال گێڕایەوە کە لەگەڵ باودا بگونجێ کە حەقیقەتە زاندراوەکان گوێی نادەنێ و ئەوەی زاندرا هەر ئەوەیە شیعرە و جێی دانانیشی ئیستەنبووڵە کە ئەوەش هەڵەیە و ڕاست کرایەوە. یەکەم تیرۆژی ڕووناکایی کە بە زەینمدا هات لەوەوە بوو کە لە بەیتی دووەمدا گلەیی لە دوورودرێژیی دەربەدەری دەکا و تویژینەوەی ورد، کە ئێرە جێگای باسکردنی نییە، بەو ئەنجامەی گەیاندم کە ئەو ساڵانی دەربەدەرییەی گلەیی لێ کردووە ساڵانی خوێندنێتی کە وەک باسم کرد یەکەم هاوینی دوای وەفاتی (حاجی بەکر ئاغا)، ساڵی 1270ی کۆچی بووە و

---

بووە و ئینقلابی بە سەر بەدرخان پاشادا کردووە کە لە کوردستانی تورکیادا، لە سەدەی ڕابردوودا سەرکردەی شۆڕشی کورد بووە و وەها لاوازی کردووە دەسەڵاتی عوسمانی دەرەقەتی هاتووە و لە ناوی بردووە. ئەوەش پێش چوونی حاجی بووە بۆ ئیستەنبوڵ. بەڵام بەوەدا زەحمەتە باوەڕ بەو خیانەتە بکرێ کە حاجی وەک کەسێکی هیوابڕاو لە چارەنووسی کورد، لە شیعرێکی نیشتمانپەروەرانەدا، بۆی گوتووە کاتێ دەڵێ هیوای کورد بە پیاوێکەوە بەستراوە کە وەکوو ناوەکەی (شێر)ە و ئاشکراشە دەلالەت لەو (عەزەددین شیر)ە دەکا کە بە (یەزدان شێر) ناوی دەرکردبوو و ئەوەش دەزانین کە دوای چەند دەیەیەک لە تێکشکانی شۆڕشی بەدرخانی خزمی، شۆڕشی بەرپا کرد و تێکشکا، بەڵام هۆی ئەوە نازانم بۆچی هەموو نووسەران لە باسی عەزەددین شێردا حەقیقەتی ئەو شیعرەی حاجییان لە بیر کردووە و سەر لەوەش دەرناکەم چ بارودۆخێ وای لە حاجی کردووە باوەڕی بە عەزەددین هەبێ ئەگەر تۆمەتێکی وا گەورەی بە دواوە بووبێ گەیشتبێتە ئاستی خیانەت بەر لەوەی بیسەلمێنێ جێگای ئەو باوەڕەیە. یا دەبێ تۆمەتی خیانەت، دواتر، لە لایەن نووسەرانەوە، بێ وردبوونەوە پێوەی لکابێ. خەیاڵی ئەو باسانە دوای سێ بەشی کتێبەکەم هەر بەری نەدام و خەریکم بگەمە دواوێستگەی ژیانی حاجی لە ئیستەنبووڵ و پەیوەندی نێوان حاجی و یەزدان شێرم ڕاگرتووە بۆ ئەوەی بگەمە ئەنجامێک لە مەزەبی مندا جێی ببێتەوە.

بەوە کۆتایی هاتووە کە حاجی ئیجازەی مەلایەتی لە مەهاباد (سابڵاغ ــ کە پێشتر ساوچبڵاغ بووە) لە کوردستانی ئێران وەرگرتووە و ئەوەش نابێ پێش 1279ی کۆچی بووبێ بەڵگەی ئەوەش نووسینێکی حاجیە بە دیوارێکی مزگەوتێکی ناسراوی مەهابادەوە کە ئەو ساڵەی لێ نووسراوە. لە مەسەلەکەدا شتی تریش هەن کە گومان ناهێڵنەوە و لە هەندێ جێی کتێبەکانمدا بە وردیی لە سەریان دواووم و دوای ئەوە بەڵگەکان گردەبڕن کە دوای بەسەرچوونی هاوینی 1279ی کۆچی یا ئەوپەڕەکەی ساڵی دواتر، بە ڕێی باڵەکدا گەڕاوەتەوە بۆ کۆیێ و ساڵانی ئەو دەربەدەرییەی بە هەمووی گەیشتە نۆ یا دە ساڵ و ئەوەش دەوری نێزیکەی هەموو ئەو تەمەنەیە کە حاجی بو خوێندن و بەدەستهێنانی زانست بە سەری بردووە، بێ ئەوەی لێی دابڕابێ {هەموو ئەوانەش بە بەڵگەی گردەبڕ پشتئەستوورن و لە جێی خۆیاندا باس کراون و چ بۆچوونێکی تر هەڵناگرن، جێگەی داخیشە بۆ سەپاندنی بۆچوون ناتوانم بیانگوازمەوە چونکە لە دەرەوەی گرنگیپێدانی خوێنەرانی عارەبیدان و ئێرە جێگەیان نییە}. ئەوەش سەلمێندراوە کە مەحاڵە لە ژیانی ڕابردووی پێش سەفەری حاجیدا بۆ ئیستەنبوڵ، جگە لەو نۆ یا دە ساڵ دەربەدەرییەی ئەوەندەی بە بەرەوە بووبێ بەشی دەربەدەری تری کردبێ و ئەگەر مەحاڵیش دانێین بڵێین مەودای وا بووە، لە بەر دوو هۆ کە لاکەوتنی ناتەبایی دەگەیەنێتە ئاستی بەڵگەنەویست، بە هیچ شێوەیەک بە کەڵکی ئەوە نایێ بە مەدحی (ئەمین ئاغا) کۆتایی هاتبێ، یەکەمیان ئەوەیە ئەو مەدحە بۆ (حاجی بەکر ئاغای باوکی ئەمین ئاغا) گوترابێ چونکە ئەو دەمانە هێشتا نەمردبوو، دوومیشیان ئەوەیە کە ئەمین ئاغا لە ساڵی وەفاتی باوکیدا هەرزەکارێکی پانزە ساڵی بووە و ئەوەش لەگەڵ ناوەڕۆکی ئەو پێنج بەیتەدا نایەتەوە کە حاجی، بەم شێوەیە ڕووی دەمی لە مەدحکراوە:

ئەی محەمەد[1] و ئەی ئەمینی دەوڵەت، کۆیەت[2] بەهەشتە و کێی لێ دوور کەویتەوە لە دۆزەخە. ئەمە چۆن بۆ هەرزەکارێک دەگوترێ کە هێشتا مووی لێ نەهاتبێ وساڵی گوتنیشمان بۆ ئەو ساڵە دواخست کە بابی تێدا مردبێ نەک پێشتر؟ سەرنج بدە ئەگەر تەمەنی ئەمین ئاغا لە کاتی وەفاتی باوکیدا بۆ ئەوە نەبووبی ئەو مەدحە بکرێ ئەوا پێش ئەو تەمەنە، جەند مەدحەکە بۆ دواوە بگێڕینەوە، زیاتر تەمەنی دەچێتە سەردەمی منداڵییەوە و کەمتر ئەو مەدحە هەڵدەگرێ. بەوەش ئەستەمێکی دی دروست دەبێ کە لانابرێ چونکە ئەگەر وامان دانا ئەو شیعرە ساڵی وەفاتی حاجی بەکر ئاغا، دوای دەربەدەرییەکی لە بەیتەکاندا دیارن، دانرابێ ناچارین بڵێین حاجی دەستی بە سەفەرێکی درێژی دی کردووە کە نۆ یا دە ساڵی خایاندبێ و لە کوردستانی ئێران و باڵەکایەتی بووبێ ئەوەش لە هیچ بازنەیەکی بۆچووندا جێی نابێتەوە... بەڵگەی تریش زۆرن کە ئەو غەریبییەی دادی بووە لە دەستی، هەر ئەوە بووە کە بە نۆ یا دە ساڵ دەستنیشانم کرد، لە نێوان 1270ی کۆچی (ساڵی وەفاتی حاجی بەکر ئاغا) و ساڵی 1280ی کۆچی (ساڵی گەڕانەوەی حاجی لە سەفەری خوێندن، بۆ کۆیە) بەڵام لێرەدا مەودا نییە باسیان بکەم. ئێستاش دوای ئەم دەستنیشانکردن و دیاریکردنە چی دەمێنێتەوە و جێگای ئێمە لەو ناتەباییە لە کوێیە کە لە واتای شیعرەکە و هەستی حاجی بە سەروەریی خۆی هەبووە؟ لێرەدا شێوەی واقعی دەوروبەری حاجی، لەو کەشوهەوایەدا کە شیعرەکەی تێدا گوتراوە لە زەینی ئاگایی و نائاگاییمدا ڕاست بووەوە و منیش بە درێژی لێی ورد بوومەوە و بە هەموو لایەکدا تاوتوێم کرد و دەستوورەکانیم هەڵسەنگاند و بۆم دەرکەوت ئەو بارودۆخە، لە ڕۆژێکی

---

[1] ناوی تەواوی (محەمەد ئەمین)ە و کورد کورتی دەکاتەوە و دەیکاتە (ئەمین)

[2] زاراوەی (کۆی) واتە کۆیسنجاق و کۆڵان بە پێکەوە.

وەک ئەو ڕۆژەدا پێویستی بەو چەند بەیتە هەبووە لە کەسێکی وەک حاجی قادرەوە بە شێوەی حەتمی نەک لە ڕوودامان. لەو بارەیەوە بە خوێنەرانی کوردم گوتووە بۆ بەدەستهێنانی ڕاستی لە ناوجەرگەی تاریکییەوە و لە بارەی حاجییەوە، دەبێ توێژەرەوە خۆی بخاتە پێستی حاجییەوە و خۆی لە جێی ئەو دانێ و دڵی ئەو بۆی لێ بدا و ئەو هەوایە هەڵمژێ کە ئەو هەڵیمژیوە و بارودۆخ و ئەرک و ناپەسەندییە کاریگەرەکانی سەردەمی ئەو زندوو بکاتەوە و ئەو کۆمەڵگایە بژێنێتەوە کە ئەوی تێدا ژیاوە تا قسەیەک یا کردارێکی حاجی بێنێتە بەر زەین کە لێی چاوەڕوان دەکرێ و لەگەڵ سروشتیدا دەگونجێ. کە من ئەو بارودۆخانەم لە بارەی ئەو شیعرەوە بۆ خۆم ڕەچاو کرد، دیمەنێکی تا ڕادەیەک ڕوونی وەهام هاتە بەر چاو چاوی نووقاو و هەستی سەرقاڵیش ئاگادار دەکاتەوە: حاجی قادر کۆیەی شار و مەفتەنی خۆی بە جێ هێشت و خاوەنی یەک تۆزقاڵ خۆڵ نەبوو و ماوەی دەوری دە ساڵ جێی هێشت و لەو پەڕی هەژاری و نەداریدا بوو و کە بۆشی گەڕایەوە، هەژارتر و نەفس بەرزتر بوو و دوای ئاوارەبوونی چ شوێنەوار و نیشانەیەکی ئەوتۆی نەبوو ئەو ناو و ناوبانگ و نەفسبەرزییەی بۆ بپارێزێ کە بە شیعرەکانی دایمەزراندبوون. نە ماڵی هەبوو نە پارە و خێزان و منداڵ، نە هیچ هۆکارێکی زندووی بیرەوەری کە هەموو سامانی ئەم دنیایەی بوو. بەهای ئەو سامانەش هەرچەندێ بووبێ لە ناو جەنجاڵی ژیاندا ئەوەندە نەبووە لە کاتی دووریدا و لەو دە ساڵی بۆشاییەدا درەخشانی ناوبانگی بپارێزێ. زەینی خوێنەری کوردم لەوە ئاگادار کردەوە کە حاجی بۆیە درێژەی بە ساڵانی خوێندن دەدا تا لە گەڕانەوەیدا ڕووبەڕووی ئەو بارودۆخە زەحمەتەی وڵات نەبێتەوە کە تیایدا هیچ شتێکی نەبوو و خوێندنیشی کردبووە پەردەیەک لە دەربەدەریدا هەژاریی خۆی لە پەنایدا دەشاردەوە، هەتا ئەوەی

ساڵەکان تێپەڕ بوون و ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت و بیانووی مانەوەی لە غەریبایەتی، لە وڵاتێکدا بە دەستەوە نەما کە لەوێش بەختی لە ماڵی دنیا و کەرەسەی پایەداریێتی وەک ئەو بەختە بێ کە لە وڵاتی خۆیدا بوویەتی و دەشزانین مەسرەفی خوێندکاری دوای زانست لە مزگەوتەکانی کوردستاندا لە سەر ئەو نانەیە کە ڕۆژ بە ڕۆژ و لە کاتی دیاریکراودا لە خەڵکانی ئەو گەڕەکە یا ئەو گوندەدا کە مزگەوتەکەی لێیە و تێیدا دەخوێنن، بە بێ منەتی بەدەستی دێنن و لەو لایەنەوە فەقێی بەچکە دەوڵەمەند و کوڕی هەژارترین خێزان یەکسان دەبەن و وا نەبێ خوێندنی چەندین ساڵی بە دووی یەکدا لە دوورەوڵاتدا و لە لای ئەو زانایانەی کە هەر یەکەیان لە بابەتێکی خوێندنی دینیدا ناوی دەرکردووە مەحاڵ دەبێ. هەڵدەکەوێ فەقێیەکی خانەقینی لە زانستی فەلەکدا لە لای زانایەکی فەلەک، لە کرماشان دەخوێنێ و ئەوجا دەگوازێتەوە لای زانایەکی دیاربەکر کە لە (فوقهـ)دا لێهاتووە و ئەوجا باروبنە بەرەو سێیەم، لە ڕەواندز دەپێچێتەوە کە ناوبانگی لە زانستی (حەدیس)دا دەرکردووە و بەو شێوەیە تا پێداویستییەکانی تەواو دەبن و پێیان چەکدار دەبێ و مەحاڵیشە لەو هەموو گەڕانەدا چێشتلێنەرێک لەگەڵ خۆیدا بگێڕێ تا چێشتی بۆ لێنێ و جلشۆرێک ببا تا لەو چەند ساڵەدا جلەکانی بۆ بشوا، بۆیە بە دانیشتوانی ئەو جێیە پشتئەستوور دەبێ کە تێیدا دەخوێنێ. کاتێکیش خوێندنەکەی تەواو کرد ئەو مافەش لە دەست دەدا کە لە خواردنی فەقێکاندا بەشدار بێ و بارودۆخی حاجی قادریش، دوای ئەوەی خوێندنی لە مەهاباد تەواو کردووە، ئاوها بووە و دەبوو لە جێیەکی دەرەوەی مزگەوت نانی خۆی پەیدا بکا و لەوێوە ناچار بوو لە نێوان مانەوە لە مەهاباد و گەڕانەوە بۆ کۆیە یەکێکیان هەڵبژێرێ و لەوەشدا ئەوەی هەڵبژارد کە کەمتر ناخۆش بوو بۆیە خۆی پێچایەوە و بە

نابەدڵییەوە خۆی بەکێش کرد و ئەو نابەدڵییەشمان لەوەدا بەدی کرد کە لە ڕێی گەڕانەوەدا ماوەی ساڵێک لە لای کۆنە ئاشناکانی، لە باڵەک مایەوە تا ئەو ڕۆژی چاوەڕوانکراوە لە وڵاتێکدا کە جگە لە سەرگەردانی و هەژاری و نەفسبەرزی هیچی تری بۆ ئەو لێ نییە. وای بۆ دەچم کە حاجی لە بارودۆخی خۆی دۆش دامابێ و زانیبێتی شوێنەواری ناوبانگی شاعیرێتییەکەی، لە دوای دە ساڵی دەربەدەری هی ئەوە نەمابێ ببێتە دارعەسا و پشتی کەسایەتییە بەرزەکەی، لە ناو خەڵکی کەڵەگەتی پلە یەکی کۆمەڵگەی کۆیەدا، کە هەموویان ڕەگ و ڕیشە و سەرچاوەی دووریان هەبووە، ڕاست ڕاگرێ و سروشتە بەرزەکەشی بەرگەی ئەوەی نەگرتووە لە ناو هەرای ڕیزەکانی دواوە بە نەناسراوی لە ناو دەریایەکی نەناسراودا بمێنێتەوە. دەبوو چ بکات و لەو بازنە داخراوە نەکردەییە پشتشکێنەی دەوریدا سەری خۆی بۆ کوێ هەڵگرێ؟! ئەگەر نەفسیش گەورە بێ جەستە لە بەجێگەیاندنی خواستەکانیدا ماندوو دەبێ.

ئەگەر بڵێم من بە خەیاڵ لەو قەیرانە دەروونییەدا ژیاووم کە حاجی لە واقعی ژیانیدا بە سەری بردووە و لەگەڵیدا شڵەژاووم و بە دوای کەلێنی دەربازبووندا لە ناخۆشییەک گەڕاووم کە سەد ساڵ بوو پێچرابۆوە، زیادەڕۆیی نییە. ئەگەر قووڵیی قەیرانەکان و بەردەوامییان ڕێی دەربازبوونیان بە سەر بنەمای ئاڵۆزییەکە بۆ ئاسان کردبم، سەیر ئەوەیە کە دکتۆر تاها حوسێن بێ ئەوەی بیری لێ کردبێتەوە، لە کتێبی (لەگەڵ موتەنەبیدا) بۆتە خاوەنی چاکە لە کردنەوەی گرێکەدا و لەوێدا بۆچوونێکی جوانیم خوێندەوە لە بارەی ئەو شێوە فێڵەی کە موتەنەبی بەکاری هێناوە تا بە سەر بەربەست و چاودێر و ڕیزی ڕاوێستاوانی دەرباری (سەیفولدەولە)ی حەمدانیدا تێپەڕێ و هاوسان و

هاوشان به لای میر و ئەو گەورەپیاوانەوە بوەستێ و جگە لە زمانی، هیچ کەرەسەیەکی تێپەڕبوونی تریشی نەبووبێ. شیعرێکی پێداهەڵدانی بێ وێنەی بۆ دانا و بە زەنگ و زرینگەی خەیاڵی ورووژانەوە وشەکانی بانگی خۆشییان دەگەیاندە خەیاڵ و ئاوها دەستی پێ کردبوو: وفاءوکما

کالربع اشجاه طاسمه        بأن تسعدوا والدمع اشفاه ساجمه[1]

لێرەدا، لە بارەی ئەو پێنج بەیتەوە ڕووی ڕاستیم لێ دەرکەوت و حاجی ئەوەی دووبارە کردۆتەوە کە موتەنەبی پێش چەند سەد ساڵێک لە دەرباری سەیفولدەولەدا ئەنجامی دابوو و ئەمیش لە کۆمەڵگەی کۆیە. ئەو پێنج بەیتە لە هێزی دارشتنی مەدحدا گەیشتۆتە جێیەک، پێشتر لە مەدح و وەفای کوردیدا و لە هەستی ئاوارەیی و کۆکردنەوەی ناڵە و گەورەیی لە وێنەی نەبووە و بوونەتە بەڵگەنامەی تێپەڕبوون و ڕێیەکی ئاسان و بەرینیان لە پێش حاجیدا کردەوە و گەیاندیانە ڕیزی یەکەمی پیاوماقووڵانی دیوەخانی (ئەمین ئاغا) و هەروەها پیاوماقووڵانی کۆیەی ئەو سەردەمە. ئەمین ئاغا بەخۆشی شاعیرێکی ناسک بووە و وشەی نەرم و نەخش و نیگاری بۆ کتێب دەکرد و جوانیی شێواز و بەهێزیی سەبک کاریان تێ کردووە و

---

[1] من ئاوهام وەرگێڕاوە، بەڵام زۆر لێی دڵنیا نیم: (وەفاتان وەک بەرزکردنەوەی قورسیی، هەتا زۆر بێ دڵخۆشکەرە   یارمەتی وەک فرمێسکە، کەی بە خوڕ بێ چارەسەرە). واتای وشەکان وا تێگەیشتم: اشجاه: اعطاه و ارضاه. واتە پێی بەخشی. طسم: کثیر، وافر. واتە زۆر. ربع (رەبەعە): حمل الحجر لاختبار القوة. واتە بۆ تاقیکردنەوەی هێز بەردەکەی هەڵگرت. ساعفە: ساعدە و اعانە. پشتی گرت. سجم: سال، دارژان.

مامۆستا حەسەن جاف، تەماشای (الفتح الوهبی علی مشکلات المتنبی) کردووە کە نووسینی (ابی الفتح عثمان جنی)یە، وای لێکداوەتەوە:

وەفای ئێوە چۆن هەوار تاریکی و تەپوتۆز خەمباری دەکا

دەبێ پێتان خۆش بێ چونکە فرمێسکی بەخوڕ شیفای بۆ هێنا   (وەرگێڕ)

چاکەخوازان و ئەدیب و هونەرمەند لە دیوەخانەکەیدا کۆ بوونەتەوە و ئەویش بە سروشت ئەدیب بووە و هەر بە ناو (ئاغا) بووە و پێداویستییەکانی سەرگەورەیی تێدا کۆ بوونەتەوە و پلە و پایەی ڕێز و خۆشەویستی بۆ دابین بوونە و ئەو باسە دوورودرێژە و هەمووشی کەرەسەی درەوشانەوە و ناودەرکردن و هۆکاری ئەوەن بێ ئەوەی شەرم بێ پێیدا بگوترێ، بەڵام لێرەدا جێی نابێتەوە. (حاجی)ش بەو مەدحە ئەو تاکە ڕێگایەی گرتە بەر کە دەیگەیاندە پلەوپایەیەکی ڕێزلێگیراو کە جگە لەوە بە هیچی تر ڕازی نەدەبوو. باوەڕیش ناکەم ئەو پێنج بەیتەی کە گەیاندیانە جێیەکی دڵنیایی چ تەفسیری تر هەڵگرن لە ناو ئەو ڕاستیانەی کە بە کەڵکی لێکۆڵینەوە دێن لە بارەی حاجییەوە. تەنانەت پاڵپێوەنەر بۆ گوتنی ئەو بەیتانە لەوە گەورەترە بۆ ڕێتێچوونی تر ڕەت بکرێتەوە چونکە ئەو بەیتانە لەو بارودۆخەدا دەچوونە قاڵبی پێداویستی و ناچارییەوە کە بەرەو یەک ئاڕاستەی دەبرد. دەبێ ئەوەش بڵێین کە حاجی لەو ڕێیەدا کە گرتیە بەر، لاسایی موتەنەبی نەکردۆتەوە چونکە هێشتا تاها حوسێن لەدایک نەببوو تا ڕێگا بۆ عەقڵی خەڵکی خۆش بکا وەک موتەنەبی بە باشترین شێوە لە کێشە دەرباز بن و کردارەکەی حاجی قادر بە دوای وەعزێکی ئامادەکراو و نموونەیەکی باوی مێژوودا هاتبێ بەڵکو پێکچوونێکی ڕێکەوت بووە لە نێوان دوو هەڵوێستدا کە سەردەم و شوێنیان جیاواز بوونە و لە هۆکار و بارودۆخدا یەک بوونە. لە شیعرەکانی موتەنەبیدا سەرنجی ئەوە دەدرێ خاوەنەکەی پێی خۆشە بەکارهێنانی ئەو نیعمەتانە حەڵاڵ بکا کە لە لای کەسانی تر کۆبوونەتەوە و باوەڕ و بەرهەڵست لای ئەو تێکەڵی خەسڵەتەکانی تری بوونە و جۆرە گلەییەک لە قەدەر دەکا بە شێوەی نادادپەروەرانە بەشی خەڵکی دابەش کردووە و ئەوەشی بۆ ئەوە بەکار هێناوە بەشی خۆی

دەستکەوێ و ڕەنگە درێژەدان بە مەدحیش بیانوو بووبێ بۆ وەرگرتنی کرێکەی، بەڵام دوور نییە کورتیی شیعرەکانی حاجی بەڵگەی چاوتێری خاوەنی بێ بۆ خەڵاتکردن و دەستپێوەگرتنی پێداهەڵدان و ڕاوەستانی لە نێزیکترین سنووری پێویست بووە. حاجی شیعری درێژیشی لە سەر بابەتی جیاواز هەن و کورتیی ئەو شیعرە خۆی لە خۆیدا لە هەستی گەورەییەوە دێ و بارودۆخی ناخۆش ململانێی ئاسوودەیی تێدا دەکا.

ئەم بۆچوون و ئەنجامگیرییانە و هەرچییەکی لە ڕێتێچوون و تێنەچوون و دووریی و نێزیکییەکی دووتوێیاندا هاتووە لە بەردەم پێشگرتن و پێویستی حوکمی بارودۆخ و ئەو پێویستیانەدان کە کتێبەکانی من لە خۆیان گرتوون و هەمووشیان لە مزێجی خاوەنەکانی ئەو نووسینەی کە لە (العراق)دا بڵاو کراوەتەوە ناحەزن و گەیشتوونەتە ئەو ئاستی ڕقلێبوونەوەیەی حەرام بکرێن چونکە پێچەوانەی ئەو بەڵگەنەویستانەیە کە ڕەتیان کردوونەوە و بە زۆر شێوەی جیاواز دڵی خۆیانیان پێ خۆش کردووە و بەوەش لە ماندووبوونی توێژینەوە لەو هۆکارە هەمەلایەنە ڕاستانە دەخەلەسێن و دەیکەنە بیانووی بەردەوامبوونی دروشمی (بژێ و بڕووخێ) و لە لای ئەوان لێکۆڵینەوەی ئەدەبی و ڕۆیشتن لەگەڵ خۆپیشاندانداندا وەک یەکن و هەردووکیان کەرەسەی هەڵچوونی سیاسین و ناحەزترین شتێ لە ڕێبازی من بۆ ئەوان پەیوەستبوونێتی بە هێنانەوەی بەڵگە لە واقیعەوە، لەوەش خراپتر ئەوەیە لە ڕێی چینایەتی و ماتریالزمی ڕووکەشەوە نییە کە لە ناو مارکسییەکاندا باوە و بە ئاسانی بە دەست دێ و لێکدانەوەی حازربەدەستی سەد ساڵ بەر لە ئێستا دەگەیەنێتە نووسەر و توێژەرەوە و جێبەجێکردنیشی بە سەر بابەتدا هەوڵێکی کەم نەبێ هیچی ناوێ و ئەو هەوڵەش هێندەی بەخەرجدانی وزەی ماسولکەیە،

هی عەقڵ نییە. ئەگەر کوردی مارکسی بە پێی ئەو دەرکەوتانە بە دوای تەفسیردا بگەڕێ لە حەقیقەتەکان دەرکەوتووە، هەر لە سەرەتاوە مەسەلەکە دەدۆڕێنێ چونکە تەفسیری چینایەتی سەد ساڵە کۆتایی پێ هاتووە و بە سەر مێژوودا سەپێندراوە. ئەگەر مەسەلەکەشی دۆڕاند ئەوجا بیانووەکان و هەڵویست بەرانبەر کەسەکان و ڕووداوەکان هەرەس دێنن ئەوەش دوای ئەوەی کەسایەتی خۆی پێ دروست کردن و کردیانیە چەقێک و بە هەموو بوونیەوە بە دەوریدا خولایەوە. ئەگەر وەک من و وەک هەر کەسێکی تر هاتە سەر ئەو باوەڕەی بە چاوی خۆی بڕوانێ نەک بە چاویلکەی خوازراوە، ڕاستییەکان بە ئاشکرا و ڕاستگۆیانە بەو شێوەیە دەبینێ کە لە ئەنجامی شیکردنەوە و لێکۆڵینەوەی هۆشەکییەوە سەرنجی دراوە و پشتی بە واقیع ئەستوورە، ئەوجا ئەو چەقۆیەی لە دەست بەردەبێتەوە کە بۆ هەڵدڕینی زگی قوربانیانی ڕابردوو و ئێستا هەڵکێشراوە و ئەو توندوتیژییەی دەنیشێتەوە کە تا ئێستا بۆ شتێک بە خەرجی داوە لە بەرژەوەندی گەلەکەیدا نەبووە و ئەو لووتبەرزییەشی بە نەمانی ئەو تارماییانەی کە تەمەنی خۆی بۆ بەربەرەکانییان بەڕێ کرد لەو ڕەوتە توند و تیژەدا نامێنێ کە خۆی بە کلک و ڕیشوەکانیەوە گرتووە و باوەڕیشی بە خۆی هێناوە شانازی پێوە بکا و ئەگەر دەستی لێ بەربێ، هیچ شتێک جێی بۆ پڕ ناکاتەوە. وای بۆ دەچین لە باشترین باردا دەتوانێ خۆی لە ڕوانینی قاڵببەستە دەرباز بکا تا دنیا بەو شێوەیە ببینێ کە خودا دروستی کردووە، یا بە گوێرەی مەزەبی ماددییەکان خۆی خۆی دروست کردووە. ئەوجا لەم ئەگەرە خاترانەیەدا، ئەگەر یەک چرکەسات بە ڕوونیی بڕوانێتە واقیع شڵەژان و دڵەڕاوکێ دەیخولێننەوە و گەردەلوولی گومان و ڕاڕایی هەڵیدەتەکێنێ کاتێ دەبینێ حەقیقەتی مەسەلەکە لە باسی شتێکی وەک نەهامەتی حاجی قادردا لە دوای تەواوکردنی

خوێندنی دینیدا لە قووڵایی نەفسیەوە سەری هەڵداوە بەر لەوەی لە ماددەی دەوروبەریەوە بووبێ دەربازبوونی خۆشی لەو هەڵوێستەدا دیوەتەوە نەک لە دروشمی چینایەتی و هەڵچوونی جەماوەری دژی دەرەبەگ و تێکبەردانی خەڵک بە یەکتردا و تەنانەت ئەوەش نەبووە خۆی بە کاری ئاسایی و بازرگانییەوە خەریک بکا بەڵکو لە خاڵی پێچەوانەی هەر بۆچوونێکدا دێتەوە کە مارکسیە کوردەکان چاوەڕوانی دەکەن و لە ناحەزترین شتدا کە لە ڕووی مێژووییەوە ئیفلاسی بە بۆچوونە فکرییەکانی دەکا. ئەوجا بە ناچاری هەموو ئەو درز و کەلەبەرانە کوێرلەمە دەکا کە لێیانەوە تەماشای دیاردەکانی کردووە و بۆ گوتنەوەی ئەو دوعا و تیۆری و بڕیاردانەی خۆی دەگەڕێتەوە کە لە جێبەجێکردنی ئەرکە باوە بێ سەرهێشەکانیدا پشتی دەگرێ تا نەفرەت لە لایەنێ بکا و ڕەحمەت و بەرەکەت بۆ لایەنێکی تر بنێرێ. دوای ئەوەش چ سەیر نییە هەموو بنەمایەک لەوانە هەڵگێڕێتەوە کە بە گوتەی ڕاستیی بنەمای لێ هەڵدەگێڕنەوە و هەموو قینی زەمین و ئاسمان لە بەرەنگاربوونەوەی تاکە ڕێتێچوونێک گرد بکاتەوە کە توێژینەوەکەی من وەک حەقیقەتێکی تەفسیرکردن بۆ پاکترین هەڵوێستی حاجی کردوومە کە زۆر لە لێکدانەوەی چینایەتییەوە دوورە. هەوڵی هۆشەکی بۆ ئەنجامگیری ڕاستییە شاراوەکان بە پێی لێکدانەوەی لۆژیکی کە لە واقعی بەرفرەوانەوە دێ، لەگەڵ کشانی بەرگی فەلسەفی بە سەر بابەتدا، هەر بابەتێک، کە کورتهێنانی ئاشکرای بەرانبەر بەڵگەی زندووی باوەڕپێکراو هەیە، جیاوازییان گەلێ زۆرە و کە ئەو جیاوازییە گەورەیەش دەبینێ ڕقی هەڵدەستێ.

حاشاش ناکەم، ڕێی تێ دەچێ ناحەزایەتی هەندێ لەو کوردە مارکسییانە بۆ لێکدانەوەی لۆژیکی وا، لە سەرنجی ورد و لێکدانەوە و

وپێوانەکاری و بەرچاوڕوونییەوە هاتبێ و بۆ ئەوە بگەڕێتەوە تێگەیاندنیان بە گوێرەی بیر و بۆچوونێک کە بەرهەڵستی بیری خۆیان بکا زەحمەت بێ و واش پێ دەچێ ئەوانەی بە شێواندن بەرەو ڕووی نووسینەکانی من بوونەتەوە وشە و بۆچوونی وا بڵێنەوە کە بە هۆی جوینەوەی دەیان ساڵیانەوە کەڕوو لێی دابن و نەزۆکییان لە گەیشتن بە لێکدانەوەی ڕووداوەکان کە بۆ هەر چاوێکی کراوە ئاشکرا و دیارە و حیزبە شیوعییە پێشکەوتووەکانی ئەورووپاش ڕەتیان کردۆتەوە، کەچی هێشتا لای کوردی مارکسی ڕۆژگار نەیشێواندووە و ئەگەر یەکێ لە حەرفەکانی کاڵ بێتەوە مۆمێکی فکریان (کە هەرگیز دانەگیرساوە) دەکوژێتەوە. زۆرینەی هەرە زۆری ئەو بابەتە کەسانەی کە ئەو نووسینەیان لە ڕۆژنامەی (العراق)دا بڵاو کردۆتەوە، کەلەشی مەعنەوییان لە سەر یەک ستوونی فکریی ڕاوەستاوە و ستوونی دووەم لە ئارادا نییە، ئەوەش ستوونی مارکسیزمە کە ڕازین کلیلی کردنەوەی غەیب و ئاشکراکەری نهێنییەکانی مێژوو بێ، بە ڕابردوو و داهاتووەوە. لەگەڵ ئەو سەرنجەی کە مارکسیزمی بەر دەستیان بێ ئاستییەکی کارەساتئامێزی تێ کەوتووە و لەوەی دەرکردووە بە کەڵکی دەمەتەقێی جددی بیروباوەڕ بێ و هەموو توانایەکیان لێ سەندۆتەوە کە بەرانبەر ڕەخنە خۆی پێ بگیرێ چونکە لە لای ئەوان لەوە زیاتر نییە زاراوەکانی مەسەلەی فەلسەفی بن و لە تاقیگەدا سەلمێندرابن و وەک چوار کردە بیرکارییە بەڵگەنەویستەکانیان لێ کردووە. سەیروسەمەرەی دیمەنی ئەوانم لەوەدا بینی کە خۆیان بە سەر ئەو پشتگرەدا داوە و سۆفیانە پێوەی بەندن کە بە دەستیانەوە ناشرین بووە کە تەفسیری هەموو شتێکی پێ دەکەن و لە بەشی دووەمی (حاجی قادری کۆیی)دا بە ئیبن بەتووتەم چواندوون کە دنیا لە بەر چاوی ببووە دوو بەشەوە یەکێکیان دنیای ئیسلام و ئەوی تریان دنیای کوفر و داوای

نغرۆبوونی هەموو پارچەیەکی ناموسوڵمانی دەکرد و دواکەوتوویی گەیشتبووە ئەوەی دنیا لە (دمرها الله و عمرها الله ـ خوا ویرانی بکا و خوا ئاوەدانی بکا)دا ببینێ. (کوڕانی ئیبن بەتووتە)ەی سەدەی بیستەمی زۆرینەی کوردی مارکسیش لە دانانی نەخشەی دنیادا، لە ڕووی فکر و مادده و ڕابردوو و داهاتوو بوونەتەوە و کردوویانە بە خانەی ئاشتی (خوا ئاوەدانی کا) ئەوی تر بۆ شەڕ (خوا ویرانی کا) و خەتێکی ڕاست لە خەتە جیاکەرەوەکانی بیری مارکسی لێکی جودا کردنەوە و مەودای تێکەڵبوون و چوونە ناو یەکەوەی لێ بڕین. لێرەدا ئەوەشی بۆ زیاد دەکەم کە دواکەوتنی جیهانی شارستانەتی ئێمەی کورد کە لە جیهانی گەلانی تر جیامان دەکاتەوە بە مۆر و لۆژیکی کوردە مارکسییەکان مۆر کراوە و بە پێوانەی بیری ماددی سەردەمی دەرچوونی (بەیانی شیوعی) لە قاڵب دراوە، کە پیر بووە و سەردەمی تێپەڕیوە و تەنانەت ئەو مارکسییەی کە هۆشی خۆی بەند نەکردبێ، دەستی لێ هەڵگرتووە. ئەگەر پێوەری وایان هەبوایە لە ڕۆحی سەردەم و ڕۆحی هەموو سەردەمێکەوە دوورتر بوایە پێیان چاکتر دەبوو و لەوانەی دوای ئەوەیان پێ بەهادارتر دەبوو چونکە ئەوینداری ئەوانە بۆ خۆبەستنەوە بە دەقی فکری ماددی کۆنەوە وەک ئەوینداری ئەوانەیە کە بۆ فەلەکناسی بەتڵیمۆس هەیانە و زۆربەی ئەو دەقانەیان پێ پیرۆزە کە هاشا لە سووڕانەوەی زەوی دەکا بە دەوری خۆردا. ئەمڕۆ لە فیلمە سۆڤیەتییەکاندا، بە تایبەتی فیلمە کارتۆنییەکانیان، دەبینین لە خۆ داخستن و لاملیی ئەدەبیاتی کۆنی شیوعی دوور دەکەونەوە و خەریکە لە ڕێی وێنە بزێوەکاندا ئەوە تێبگەین کە لەگەڵ بۆچوونەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا دەخولێنەوە کە دێن قارەمان لە پیاوی ئاین و میر و جادووگەر پێکدێنن ئەوەش بێبەریبوونە لە بۆچوونی چینایەتی توندڕەو چونکە ئەوەیان زانیوە لە تیگەیشتنی قەوارەی ڕووداوەکانی

مێژوو و پێشکەوتن و تێکشکان لە مێژوودا، کورتیان هێناوە. هەروەها لەو زنجیرانەدا، شارستانەتی و زانست و هونەری سەردەم ئەو ئاڵقە فکرییە بۆشانە جێ دەهێڵن کە وا لە ڕێبوارانیان دەکەن بە ناو بازنەیەکی بۆشدا بە دەوری خۆیاندا بسووڕێنەوە بەڵام کوردی مارکسی ڕاستگۆ و دڵسۆزی باوەڕەکەی خۆی، هێشتا لە نەخشەیدا ڕووداوە سیاسییە جیهانییەکان و ڕۆحی گۆڕانکاری لە باوەڕەکەی و بابەتی فکری وا کە گردەبڕ بێ، هەن و وەک ئەوەی لە سەرەتای بزووتنەوەی کۆمۆنستییەوە هەموو دنیا و هەرچی و هەرکێی تێدابوون دەخستە دەم هەڵدێرێک و دەتگوت تەنافبازێکە لە سەر داوی باریک سەما دەکا. ئاخر سیاسەت و ئابووری و مێژوو و هونەر و ئەدەب و باوەڕی ئاینی لە لای کوردێکی بە ڕاستی مارکسی، لە خۆڕا باوەڕیان وەرنەگرتووە تا مرۆ بتوانێ بە دەوری خۆیدا بخولێتەوە تا لە هەر چوار لاوە شتەکان ببینێ بەڵکو هەموویان داوی باریکن و پانایيان نییە و یەک تاکە ئاڕاستەیان هەیە و وەک فەرمانی وەرزشی قوتابخانان، مرۆ بە ڕێوە دەبات: بەرەو پێش، بڕۆ! لە هەمان کاتدا بە ئارەزوویەکی زۆر و سۆفیێتییەکی زۆرترەوە، هەموو ئەو بۆچوونە گرژانە دەخوێنێتەوە کە بیری مارکسیزم لە کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەمەوە لە خۆی گرتووە و ئەوەش وەک ئەنجامێکی سروشتی چاوەڕوانکراو، لە لایەکەوە بە هۆی تازەیی فەلسەفەی مارکسییەوە و لە لایەکی ترەوە بە هۆی نەگونجانی واقیعەوە بووە لەگەڵیدا. ئەوە بە دڵسۆزیش بە سەر ئەو جۆرە بیرە کراوەیەدا زاڵ دەکا کە لە سەرەخۆ، دوای ئەوەی خرۆشۆف پەنجەرە بەناوبانگەکەی لە یەکێ لە دیوارەکانی ناوچەکەدا، بە سەر لۆژیکی مارکسیزمی ڕەسمیدا کردەوە، دنیای کۆمۆنیزمی گرتەوە. ئەوەی ڕاستیش بێ، ئەو ڕۆژەی ئەو پەنجەرەیە دابخرێتەوە و بگەڕێنەوە بۆ ئەو بەندیخانە فکرییەی کە

ستالین تیایدا وەک خوای بێ هاوتا دەپەرسترا و هەموو بیدعەیەک و داهێنانێکی سەفسەتی کە بە ناو و دروشمی کرانەوە و پێکەوەژیان و وەلانانی توندوتیژی و شتی بۆرژوایانەی لەو بابەتانە حەرام دەکرێن، دەبینی کوردی مارکسی هەر ئەوەتا شیوەن بۆ لەدەستدانی بەها و بۆگەنبوونی ویژدان ناگێڕن کاتێ بە نابەدڵییەوە هەواڵێک لە بارەی هەڵوێستی سەربەخۆی شیوعییە ئەوروپاییەکان لە سەر ڕووداوەکانی جیهان دەبیستن و ڕەتکردنەوەی بێشەرمانە دەیانگەیەنێتە ئەو ئاستەی بە ئاشکرا بەرەوڕووی کریملن ببنەوە. وەک لە کۆمۆنستێکی ئەمەریکایی دەگێڕنەوە، پێی خۆش بووە پەیکەرێک بێ لە یەکێ لە گۆڕەپانەکانی مۆسکۆ، نەک سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بێ. کۆمۆنستی کوردیش لێی خۆش دێ دنیا کاول بێ نەک بیری ماتریالیزم پێ بە پێی پێداویستییەکانی ژیانی هاوچەرخ بگوشرێ بۆیە تەوقی مەترسی و حەرامکردن و خیانەت بە دەوری بیروباوەڕەکاندا دەگێڕێ و پەرژینی زۆرەملێ و زۆرداری و حوکمی عورفی کە بە دەوری ئیرادەی مرۆڤەوەن تێکدەشکێن و بەهەشتی خوا لە سەر زەوی بە پێی بۆچوونی مارکسستی کورد ئەو ڕۆژە پێکدێ کە دیواری بەرلین بەرەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا درێژ بێتەوە تا بازنەکە بە دەوری زەویدا تەواو بکا و ژمارەی خەتە پانەکانی زەوی بۆ 181 بازنە بەرز بکاتەوە یەکێکیان لە چەمەنتۆی شیشپەست بێ: ئەوەی کە لێرەدا دەیڵێم دەرخستنی لایەنی پرشنگداری بیری مارکسیسزمە لە لای کوردە ڕۆشنبیرەکان چونکە لەو شێوەیەدا چالاکی هۆش هەیە ئەگەرچی نەرێتی و بەرەو دواوەیە، چونکە زۆرینەی ئەوانەی خۆیان بە مارکسی لە قەڵەم دەدەن توانایان بە سەر شتێکدا ناشکێ پێی بڵێن کرانەوە تا بە پێی پێچەوانەکەی بیپێوی و بگەیتە ئەنجامێک بێزاری بکا یا دڵی خۆش بکا و لە هەموو هەڵوێستێکدا بەرانبەر بیر و کار و

ڕووداو هەر ئەوە دەڵێتەوە کە بە پاککراوی خراوەتە بەر دەستی و ئەوەندەش بەختی نییە کڵێشەکان و زاراوەکان بە ڕاستی بڵێتەوە و ئەوەشی وەک هیتافەکانێتی لە دادگای مەهداوی کە بریتین لە بڕووخێ و بژێ و ئەگەر لە هەڵبژاردنی واتا و بەهادا سەرپشک بوایە، لە نێوان داس و کۆمپادا داسی هەڵدەبژارد چونکە ئەمەیان پەیوەندی بە سەرەتای مارکسیزمەوە هەیە.

کە بەرەنگاری ئەو نووسینە بوومەوە دەمزانی ئەو جۆرە ئاستە فکرییانە چ دەگەیەنن و چ بەرهەڵستییەکیان لە بەردەم ئەو نووسینە ئازادانەدا هەیە کە دانابەزنە ئاستی نزم و لە ڕێساکانی فکری تاریک سڵ ناکەنەوە، بۆیە بە هەموو توانایەکمەوە خۆم لەو بیانووانە نێزیک کردەوە تا ئەو کورتبینییە ئاشکرا بکەم کە توانای تەفسیرکردنی کەونی نییە، بە جێ و کات و مرۆڤیەوە و هەوڵم داوە سەرنج بۆ ئەوە ڕاکێشم کە مەحاڵە ڕووداوەکانی سەردەمە دێرینەکان، بەو پێیە ڕوویاندابێ کە تیۆرییەکان، هەر تیۆرییەک بێ، کە ڕەهەندەکانیان سنووردارە و بەرەنگاری هاوکێشەی کۆمەڵایەتی و کەونی دەبنەوە کە ملیۆنەها نەزاندراویان تێدا هەن. بۆ دەرخستنی بێدەسەڵاتی ئەو فکرەی کە لە حاجی قادری دەوێ ببێتە نموونەیەک بۆ ئاسوودەیی ئەو سەرەڕۆیانە کە لە دوای مردنی بە نیو سەدە دڵی خۆیانی پێ خۆش دەکەن زۆر ماندوو بووم چونکە خواستەکەیان تا ئەو ئەندازەیە قورسە پیاوی عاقڵی ڕۆژگارەکەشیان بە دەستیەوە دامێنێ و مەحاڵە یەکێکیان بتوانێ ئەوی تریان ئاسوودە بکا. ئەوەی خەریکی تۆژینەوە بێ لە سەر هەر شتێک، چار نییە هەر دەبێ تووشی مەترسی ببێ لە بواری ڕۆشنبیری کوردیدا کە بەرپەرچی لێکدانەوەی ئامادەکراوی قاڵبگرتووی وا دەداتەوە، سەد ساڵ زیاترە ئامادە کراوە و ئەو واقیعە

کارەساتئامێزەی کە بیستوپێنج سەدە زیاترە کوردی تێدا دەژێ وێنەی کۆمەڵایەتی و مێژوویی وامان دەداتێ هەر دەبێ پێچەوانەی هەمان ئەو دیاردانە بن کە لەو میللەتانەدا هەن کە دووهەزار و پێنجسەد ساڵە نەچەوساونەتەوە و ئەوەش وا دەخوازێ حوکمی وایان هەبێ کە لەو واقیعەوە نەبێ پەیدا نابێ و بە گوێرەی بارودۆخی کورد بنەمای حەسانەوەن، جا ئاستی زوڵم و خراپەکاری تێیدا هەرچۆنێک بووبێ. بە کوڕانی میللەتەکەمم گوتووە ئەگەر قسەکانی مارکس لەسەر پلەکانی پێشککەوتنی مێژوویی بۆ ئەو گەلانە لە بار بن کە وەک کۆرپەلەی ناو زگی دایک کە جارێ لەدایکیش نەبووە لە کیانی خۆیاندا دەقیانگرتووە، بۆ ئەو میللەتەی دابەش کرابێ و بە درێژایی سەردەمەکان بێگانە حوکمی کردبێ دەبێتە خورافات چونکە ئەو گەلە نە خاوەنی خۆی بووە نە خاوەنی مێژووەکەی بووە نە خاوەنی خاک و چارەنووسی خۆشی بووە. دواکەوتووترین سەردەم لە گەلێکدا کە چارەنووسی بە دەستی خۆیەوە بێ ئامانجێکی مێژوویی بەرز و پیرۆز و شەرەفمەندانەی هەیە و بەجێگەیاندنی بۆ کورد بۆتە مەحاڵ. لاوازی واقیع و شارستانی و کۆمەڵایەتی و مێژوویی و فکری و ڕۆحی چەوسێنەری کورد گەیشتە ئەو ئاستەی لێنەگەڕی خۆی بۆ بەربەرەکانیکردنی چەوسێنەری خۆی تەرخان بکا و چەندین سەدە لە بارێکدا مایەوە بەراوردکردنی نێوان چەوساندنەوەی کۆمەڵایەتی ناوچەیی و چەوساندنەوەی کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتی و سەربازی داگیرکەر بکا و پرسیارێکم ئاڕاستەی ڕۆشنبیری شۆڕشگێڕی ئەم سەردەمەی کورد کرد کە تیایدا داوا کراوە هەڵوێستی خۆی لەوەدا دیاری بکا، جەندرمەی تورک پایەدارێکی کورد بەرەو قەنارە ڕاپێچ دەکا، ئایە وەهمی تیۆری بە سەریدا زاڵ دەبێ و لایەنگری جەللادەکە دەبێ تا بە سەر ئەو (دەرەبەگ)ەدا زاڵ بێ!!! خودا شایەدە حاجی قادر لەو شێتییە دوودڵ

نەدەبوو و نەیدەتوانی ڕقی ئەوانە بێنێتە جۆش کە لە دوای خۆی بە تیۆری مەست بوون تا وای لێ بێ جیاوازی لە نێوان زاڵم و زوڵملێکراودا نەکا...

جێی ڕێزی هەموو ئەو مرۆڤانەیە کە ڕێزی ڕاستگۆیی دەگرن، ڕێزی ئەوە بگرن کە گوتم ئەگەر بشێ بیرمەندێک گەلی کورد و گەلی فەرەنسی یا ئەڵمانی لەوەدا بباتە ڕیزی یەکەوە کە ملکەچی یاسای مێژوو و هۆکارەکانی پێشکەوتن و پێوەرەکانی زوڵم و دادپەروەری کۆمەڵایەتین و دەبێ بزانن چ جیاوازییەکییش لە نێوانیاندا هەیە کە لە دەرەوەی هەموو پێوانەیەکن و ئەو ڕایەشی هەبێ کە هاوسانی چینایەتی لە نێوان کرێکاری کورد و بازرگانی کورددا هەیە، چونکە دووری مەودای نێوانیان لەوە کەمترە کە لە نێوان مەودای مێژوویی گەلی کورد و گەلی فەرەنسی و ئەڵمانیدا هەیە. ئەو دیمەنە دەمترسێنێ کاتێ بلیمەتێکی بیرمەندی کورد سوور بێ لە سەر ئەوەی توندوتیژی لە نێوان دانیشتوانی ڕانیەدا، بە هۆی جیاوازی چینایەتییەوە، لە نێوان گەڕەکەکاندا بقەومێ و ئەوجا داوا لە سەرجەمی میللەت بکا تیۆرییەکەی قەبووڵ بکەن کە جیاوازی لە نێوان ئەوان و گەلە پێشکەوتووەکاندا لە دارشتنی مێژوودا نییە و دەبێ وەک یەک سوود لە یاساکانی وەربگرن لە کاتێکدا لە هیچ شتێکدا یەک ناگرنەوە لەوەدا نەبێ کە هەردوو لایان مرۆڤن و ئەندامی جەستەیان بە یەک دەچن و کۆیلە و خاوەن کۆیلە وەک یەکن و گەلان و چەوسێنەری گەلان، کرێکار و بۆرژوازی، وەرزێر و خاوەن زەوی و بەندیوان و بەندکراو وەکوو یەکن. مەحاڵیشە دووریی مێژوویی نێوان کورد و ئەو میللەتانە لە داهاتوویەکی دیاردا بزر بکرێ بەڵام چ بەرهەڵست لەوەدا نییە کۆیلە ئازاد بکرێ و کرێکار پشتگیری دارایی بکرێ و وەرزێر زەوی

پێ بدرێ و بەندکراو ئازاد بکرێ. ئەم وێنانە وا لە دەماغی بیرمەندی چینایەتی کورد ناکەن تاکە ژێیەکی ببزوێ و ئاڕاستەی چاوی لەو تاکە سەرچاوە ڕووناکاییە لابەرێ کە لە سەر شاشەی خەیاڵیدا هەیە.

لایەنێکی کارەساتی مێژووم بۆ ڕۆشنبیری کورد ڕوون کردەوە ئەوەندە دێنێ بە قەدەر ئەو کارەساتانەی گەلەکەی کە دەیان سەدە تیایاندا ژیاوە، بیری بورووژێنێ و گوتم ئەگەر قوربانییەکانی عوسمانییەکان لە ولاتێکی، بۆ نموونە وەک بولگاریا ناوی درەوشەدار و بیرەوەری نەمری لە دوای خۆیەوە بۆ تاکەکانی ئەو گەلە و گەلانی دەوروبەر جێهێشتبێ، قوربانییەکی وەکی ئەوە لە ناو کورددا هیچی بۆ نەماوەتەوە نیشانەی خیانەت نەبێ کە لە جەللادی خۆی وەرگرتووە و بردوویەتیە قەبرەوە و خوێنی بە هەدەر چووە و بە لمی لەناوچووندا ڕۆچووە. ئەگەر خەسارەتی گەلی کورد بەوەوە بوەستابا مۆری خیانەتی لێ بدرێ و خوێنی تا ڕۆژی قیامەت بە هەدەر بچێ، موسیبەتەکە ئەهوەن دەبوو چونکە کاتێ دوای چەندین سەدە لە بەهەدەرداني خوێنی ئەو قوربانیانە، ڕۆشنبیری کورد دێت و ماوەیەک بۆ ئەوە زندووی دەکاتەوە تا تف لە چارەی بکا و دووبارە لە بری ئەو جەللادانەی مەرگ پێچاونیەتیەوە ئیعدامی بکاتەوە، کارەساتەکە چەندین بار زیاد دەبێ. گوتیشم مێژووی دەستڕۆیشتوو قەڵەمی زێڕینی خۆی بە خوێنی کوردە قوربانیەکانیدا ناکا تا دێڕێکی لە سەر بنووسێ و ناوی بپارێزێ ئەگەر پلەی لە میری بابان و دەسەڵاتداری سۆران کەمتر بووبێ: خوێنی سەرەکعەشرەتێکی کورد لەوە هەرزانترە بکرێتە مەرەکەب لە مەرەکەبدانی مێژوو و خەتکوژێنەوەکەیدا.

پیاوێکی وەک (هەمزە ئاغا)ی سەرەک عەشرەتی مەنگوڕ، کە لە سەر خاکی کوردستان، لە نێوان ئێران و دەوڵەتی عوسمانیدا نیشتەجێن و لە سەردەمی حاجی قادردا ژیاوە، عوسمانیەکان گرتیان و چەند ساڵێک لە بەغدا بەندیان کرد و دواتر بۆ ماوەی چەند ساڵێکی تر بۆ ئیستەنبووڵ دووریان خستەوە، ئەوجا بە هۆیەکەوە کە قسان لە سەری یەک نین، ئازاد کرا و دوای ئەوە، ماوەیەک بە دەربەدەری و بە مێوانی لای عەشرەتی پشدەر مایەوە و حکوومەتی قاجاری ئێران، بە بەڵێنی فێڵ و سوێند، بەرانبەر نارەزایی هەندێ لە سەرۆکعەشرەتەکانی پشدەر کە لە دەست ئەو جۆرە بەڵێنانە هاواریان بوو، دڵنیایان کرد و گەڕاندیانەوە ناوچەی دەسەڵاتی خۆیان و بە تۆمەتی یەکێ لەو تاوانانەی کە گورگ بەرخی لە سەر دەخوا، هەر زوو ئیعدامیان کرد. لە چ سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوی فکر و فەلسەفە و دادپەروەری و ویژدانەوە یەک هۆکار بدۆزینەوە تا دەستخۆشی لەو لەناوبردنە بکەین و لەگەڵ ئەو دەستە خوێناوییەدا بوەستین و بەرانبەر تارمایی تەرمەکەی کە بە قەنارەوەیە، بۆ دەستخۆشی چەپڵە بکوتین؟ عەشرەتەکەی زۆریان سوێ لێ بوو و داستانیان لە سەری هەڵچنی و ژنان پرچی خۆیان بۆی بڕی و پیاوان فەقیانەیان لە خم نا بۆ ئەو پیاوەی لە ناو عەشرەتە کورد و ناکوردەکاندا خۆیان پێوە هەڵدەکێشا و بە نەمانی، زرێی خۆپارێزییان لە دەست دا و پەرژینی دەوریان تێکشکا. چۆن دوای سەد ساڵ لە دادانەوەی ئەو دیمەنە دڵتەزێنە بە فرمێسک و خوێنە دەستێکی (کافووری) بۆ سەری ئەو ژنە کۆستکەوتوانە درێژ کەن تا قژیان دابێنێ و سوورایی و زەردایی بگێڕێتەوە سەر گۆنایان و دڵخۆشکەر و پسپۆری ڕازاندنەوە بنێرین دڵی ئەو پیاوانە خۆش بکەن و جلیان ڕێکبخەن تا بەشداری لەو ئاهەنگەدا بکەن کە کوردی بیرمەندی چینایەتی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا لە خۆشیی لەناوچوونی

دەرەبەگ دەیگێڕێ! کە ئەمە دەڵێم لەوەش دڵنیام بیرمەندی چینایەتی ئەو لایەنەی قسەکانم دەقۆزێتەوە کە بەرگریکردنی تێدایە لە ژیانی کەسێک، ئەو خۆی بە چەوسێنەر و خوێنمژ داناوە و چ گلەییش لە خۆی ناکا بەو هەڵوێستەی بەشداری بکوژە داگیرکەرەکان دەکا کە بنەماڵەی قاجارەکانن و دژی هەستی عەشیرەتگەری کوردیشە کە بە پێی بارودۆخ و پێداویستییەکانی ئەو سەردەمە، لە سیمبولی هێزیان دراوە و لێیان قەوماوە. لێرەدا، هەردوو لامان بە جۆرێ جیاوازیمان هەیە کە پێکگەیشتنمان هەڵناگرێ و ئەگەر بەرانبەر دەرەبەگێک لێبوردە بێ کە بە هۆی زوڵم زۆرەوە خەڵکی عەشرەتەکەی ڕقیان لێی بێ، دیسان لەگەڵیدا جیاوازم چونکە لێبوردنەکە لە بەرژەوەندییەکی تەسکی تایبەتی یا حیزبایەتییەکی کورتخایەنەوە دێ، ئەگەر ئەوەی بۆ بشێ دەبێ بۆ کەسانی تریش بشێ و ناتەبایی بە شێوەیەک دەکەوێتە نێوان تیۆری و پراکتیکەوە چ چاوەڕوانی چاکەی لێ ناکرێ.

حاجی قادر بە چاوی خۆی مەرگی هەندێ لەوانەی دی کە بە دەستی بێگانەی داگیرکەر ئیعدام کران یا هەواڵیانی پێ گەیشتووە. هەر لە کۆیە کە حاجی تیایدا گەشەی کرد و نازناو و شاعیری و ناوبانگی بە دەست هێنا، داگیرکەری ڕەشی بێگانە لە ساڵی 1237 و 1238ی کۆچیدا دوو قەسابخانەی گشتی لە ناو یەکێ لە بنەماڵە ناودارەکاندا بەرپا کرد و ڕۆڵەی وای هەیە فۆلکلۆری کوردی لە سەرتاسەری کوردستاندا پێیدا هەڵداوە و ئێستاش یادگارییەکەی لە هەر جێیەک کە ڕێز لە پیاوچاکی مابێ ڕێزی لێ دەگیرێ. خۆ ئەگەر لەدایکبوونی حاجی دەوروبەری 1240ی کۆچی بووبێ و سەفەرەکەی بەرەو ئەستانە 1280ی کۆچی بووبێ مێژوو لە هەردوو لای ڕۆژگاریەوە کە

لە کوردستان بە سەری بردووە دوو تابلۆی خوێناوی جێ هێشتووە کە داگیرکەری بێگانە بە خوێنێ نەخشاندوویەتی لە دڵی حاجیدا ئازیز بووە و بەردەوام لە دەروونیدا کڵپەی سەندوە و بۆتە ئاماژەی خواستی ڕزگاربوون و ناڕازیبوون بە زوڵم. هەواڵە دەماودەمەکان وا دەگێڕنەوە کە یەکێ لەو نێرینانەی لە یەکەم قەسابخانەدا دەرباز بووە کۆرپەیەکی ناو بێشکە بووە و خێرخوازان لە ئاوڕۆیەکی پیسدا شاردوویانەتەوە تا ئاگری فیتنە دامرکاوەتەوە. تۆ بڵێی تیۆری ڕقبوونەوە لە دەرەبەگ تۆڵەکردنەوەی چینایەتی شۆڕشگێڕ بخاتە کار و جێی شاردنەوەی خاوەن بێشکەکە بە پیاوکوژان بگەیەنێ تا لە کەسێ ڕزگار بن کە ڕێی تێدەچێ لە پاشەڕۆژدا ببێتە دەرەبەگ؟ تیۆرییەکان چی دەڵێن با بڵێن و بڕیاری کەرامەت و غیرەت چی دەبێ با بێ، ئەمڕۆ لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمدا خەڵکانێکمان هەن، دەروونیان بە ناوی سۆسیالیزم و جەماوەری و پێشکەوتنخوازییەوە لێیان دەوێن خەبەر لە کۆرپەیەکی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە بدەن تا سەر ببڕدرێ یا پارچەپارچە بکرێ و شانازی درۆینەی ئەوەیان هەبێ بەڵایەکی بەدیان لەناو داوە. بە دەم ئاشکراکردنی ئەو باوەڕە سەرەوژێرانەوە ئەوە دەڵێم کە بووە و ئەو بیروهۆشەی داگیر کردووە کە بە سەریدا سەپاوە و بەڵگەی ڕاستی ئەو خەیاڵەم ئەوەندە بە ڕوونی بە دەستەوەیە لە ئاشکرایی بەیان ئاشکراترە: یەکەمیان خەبەردانە لە مردووی پێش سەدەیەک و پێشتر باسم کردووە کە شوێنەواری قوربانییەکانی سەردەمە بەسەرچووەکانی گەلەکەی خۆیان دەرهێناوە تا تفیان لێ بکەن و جارێکی دی ئیعدامیان بکەنەوە و خواستی دوژمنی داگیرکەر جێبەجێ بکەن. دووەمیشیان لە ڕۆژگاری ئێمەوەیە ئەوەش بەردەوامییانە لە سەر ڕاپۆرتنووسین و گەیاندنی هەواڵی هەڵبەستراو لە سەر هەر مرۆڤێک ڕاستگۆیی تێدا بەدی بکەن لەگەڵ هەر لایەنێکدا وەفای بۆ ئەرکی خۆی هەبێ و

بەشی کۆڕی زانیاری کورد کە من تێیدا شەرەفمەندی خۆتەرخانکردنم، لەو بوارەدا لەوە ئاشکراترە هاشای لێ بکرێ.

هیچ کەسێک وا نەزانێ بەرانبەر ئەو نەهامەتییە کۆمەڵایەتییە هەمەلایەن و هەمەشێوە و هەمەڕەنگ و قووڵ و بەرینانە بە بێلایەنییەکی وا وەستابم وەک کەسێک لەو واقیعە بێزار بووبێ و ڕقی لێی هەڵستابێ و لە ئەنجامدا پشتی تێ بکا. لە پەراوێزی بەرچاوڕوونی و وردبوونەوەوە لە ڕاستییەکان، بەرگرییەکی تەواوم بە دەست هێنا بۆ ئەوەی نەکەومە داوی بێئومێدی و ڕەشبینییەوە و لەو ئاگادارییەی مێژووەوە بەو ئەنجامە گەیشتم کە لە وردبوونەوەدا کەمتەرخەمیمان هەبووە و جێی کەموکوڕیمان نەدۆزیوەتەوە کە جگە لە کورد و خەڵکی وەک کورد کە لە قووڵایی بیستوپێنج سەدەوە هاتبێ کەس بیانووی بۆ ناهێنێتەوە. لە بارەی سووربوونی ڕۆشنبیری کوردەوە بۆ ڕوانینی دیاردەکان بە چاوی خەڵکی دی، کورد ناتوانێ پێشڕەو و سەرکردەی لە بواری فکر و فەلسەفەدا هەبێ بەڵام بە پێی سروشتی شتەکان لاساییکەرەوەی دەبێ، ئەوجا بۆ ئەو پاشکۆییەی بواری فکر بیانوویەکی ترم دەست کەوت کە ڕوونم کردۆتەوە. وا دانێ موعجیزە کوردێک بێنێ و بیکاتە پێشڕەو و سەردار و داهێنەر و توێژەری بواری فکر و فەلسەفە و مێژوو و کۆمەڵایەتی و بە چاوی کوردێکی ڕەسەن ڕوانییە هەموو شتێکی پەیوەست بە کوردەوە و بە لێهاتوویی خۆی وەڵامی هەموو پرسیارێکی دۆزییەوە و دەرمانی بۆ هەموو دەردێک دانا، لەگەڵ ئەوەشدا لایەنی لێهاتوویی و پێشڕەوایەتی و سەرداریێتی دەستەپاچە دەبێ چونکە دەرمانخانەیەکی کوردی نادۆزێتەوە دەرمانە کوردییەکەی تێدا تێکەڵ بکا و بە گوێرەی دەردە کوردییەکان بیانگونجێنێ. بیانووی سێیەمیشم بە دوای ئەوەدا هێنا لەگەڵ واقعی ئەم جیهانەدا بێتەوە،

چونکە ڕۆشنبیرانی ئەو گەلانەی کیانی خۆیان هەیە و دەرمانخانەی تایبەتی خۆیان هەیە، دەیان ساڵ هەر لاسایی خەڵکی تریان کردۆتەوە، جا لە بواری ناونانی نەخۆشییەکاندا بووبێ یا دەرمانەکان و نموونەیەکم هێناوەتەوە کە بڕیاری حیزبی شیوعی فەرەنسی بوو لە دەسبەرداربوون لە دیکتاتۆری پرۆلیتاری و دەبوو هەر زوو ئەوەیان کردبا. خوێنەری عارەبی لەمەوە دەبینێ کە من لە کونجی تەریکی خۆمەوە دەست دەدەمە بابەتێک وەک ئەندامێکی تەرخانکراوی کۆڕی زانیاری کورد بەرپرسیارەتیم لە توێژینەوە کەوتۆتە ئەستۆ و هەوڵ دەدەم هەموو لایەنێکی پەیوەست بە بابەتەکەوە و هەرچییەکی لێی جیا دەبێتەوە و کاریگەری لە سەری هەیە و کاری تێ کردووە بکەوێتە بەر چاووم تا فرەوانی بەرچاو و ڕەهەندە مێژووەکە ئەو خەیاڵانە بهەژێنن کە لە سەر فکری نەگۆڕی هەڵوێست و پێگە و قاوغی خۆیان وەستاون ئاوڕ لە واقعی فرەوان بدەنەوە کە جۆرەها بەرە و ڕەهەند و بۆچوون و کاریگەرییان هەیە و دەشزانم ئەوە ئاسان نییە ئەگەر نەڵێم مەحاڵە. بتپەرستی، هەزاران ساڵ دەوامی بوو و ئێستاش بە جۆرە هێزێکەوە ماوە و ئەو هێزەی کە پێشانی دەدا ئەوە دەسەلمێنێ کە تا پاشەڕۆژێکی دوور و درێژ دەمێنێتەوە. ئەوەی لەو عەقڵە بەرتەسکانەدا نەزاندراوە کە لاسایی دەکەنەوە ئەوەیە زۆرترین پەیوەستبوونی بەو بابەتانەوە دەبێ کە زۆرترین ڕەخنەیان لێ دەگیرێ و لە بوارە فکرییەکاندا بەرپەرچ دراونەتەوە و زۆرترین بەرهەڵستی بەڵگەی گردەبڕی بە درۆخەرەوە دەکەن کە باوەڕەکەی ڕەت دەکەنەوە. لە بەر ئەوەی لە عیبادەتەکەیدا بنەمای توندوتۆڵ ئەوەیە کە لە هەموو سەردەمێکدا شەڕ لە نێوان دەرەبەگ و جووتیار، کرێکار و سەرمایەداردا هەبێ و هەموو گەلان لەو بوارەدا یەکسانن و چ چار نییە دەبێ حاجی دوژمنی دەرەبەگی کورد و دەوڵەمەندەکانی سەردەمی

خۆی بووبێ ئەگەر ڕاست بێ حاجی خەسڵەتێکی وای لە بواری نیشتمانی و مرۆڤایەتیدا هەبووبێ شانازی پێوە بکرێ و بە نەبوونی ئەوەش یەکێ لە دنگەکانی هەرەس دێنێ: یا ئاینە ماددییەکە بەتاڵە یا حاجی قادر کەسێک بووە، دژی جەماوەر بووە و لەگەڵ ڕەوتی دەرەبەگ و هاوسنفەکانیاندا ڕۆیوە، بەڵام لەبەر ئەوەی ناوبانگی حاجی لە بواری نیشتیمانی و نەتەوەییدا ڕوون بووە و لەوە دەرچووە جێی دەمەتەقێ بێ، لە بەردەمی دەروێشی مارکسیدا هیچ نەما یەک ڕێ نەبێ کە بۆی بچێ، ئەوەش سەپاندنی زۆرەملێیە بۆ ئەوەی حاجی دوژمنایەتی ئەو ناودارانەی سەردەمی خۆی کردبێ و ئەوەش تاکە ڕێیەکە لایەکانی هاوکێشە کۆمەڵایەتییەکە پێی ئاسوودە بن و بەوە تیۆرییەکە لە ڕەخنە دەخەلەسێ و حاجیش بە پێی پێوانەی مارکسی دەبێتە قارەمانێکی جەماوەری و بەخۆشی، بە بۆچوونی زرینگەدار کە هیچی لە سەر ناکەوێ و خێروبێریشی بەسەردا دەبارێنێ، بەردەوام دەبێ لە لەناوبردنی خەڵک.

ئەوەم لە بەر چاو بوو باسکردنی شتێکی بەڵگەنەویستی ڕوونی پشتئەستوور بە بەڵگەی نووسراو و گوتراوی وا کە تەفسیری خۆی لە خۆیدابێ لە بارەی یەکێ لە هەڵوێستە دیارەکانی حاجی قادرەوە، چ زەحمەتییەکی زۆری تێدایە و توندوتیژی کاردانەوەی لە لایەن دەروێشە مارکسییە کوردەکانەوە هەر زوو لە هۆشمدا جێگیر ببوو و دەمزانی لە ڕێی وەهمە خۆش و سەقەتەکانیانەوە کە لە دڵنیابوونی ڕووکەشی باوەڕیانەوە هەڵدەستێ لە هەماهەنگی بواری ململانێی چینایەتییەوە لەگەڵ ئەوەی کە لە بارەی (جەماوەریبر مارکسییەوە) دەیڵێنەوە کە داویانەتە پاڵ حاجی قادر زەحمەتییەکە هەندێ لە حەقیقەتی هەڵوێستی حاجییەوەیە کە بەرانبەر دەرەبەگ پێچەوانەی

ئەو بۆچوونانە بووە کە بە گوتنەوەیان ئاسوودە بوونە و کەموکوڕی لەوەدا نییە حاجی بەرپەرچی وەهمی دابنەوە چونکە ئەو بەرانبەر دەرەبەگ بێدەنگ بووە و چ بە خراپەی باس نەکردوون بەڵکو بەوەی کە مەدحی کردوون زیانی بەو وەهمانە گەیاندووە و لەوەشی تێپەڕاندووە و شانازی کوردی بەوانەوە گرێ داوە. لەو نارەحەتییەدا، زیادەیەکی زیاد لەو ڕاستییەوە بوو کە هەڵوێستی ڕاستەقینەی حاجی قادر بەرانبەر (دەرەبەگ) پێچەوانەی ئەوە بوو کە حەزیان دەکرد بیلێنەوە. کەموکوڕی حاجی بۆ بەرپەرچدانەوەی خەیاڵەکانیان هەر ئەوە نەبوو لە ئاستی دەرەبەگدا کڕ بێ و خراپەی بۆیان نەبووبێ بەڵکو بەوەی شیعری مەدحی بۆف دانان خراپتری بەو وەهمانە کرد و بەوەشەوە نەوەستا و ئەو سنوورەشی بەوە تێپەڕاند زۆر لە شانازییەکانی کوردبوونی بە بەرزیی ئەوانەوە گرێ دا و لەوەشدا بەرەو باڵا کشا کە کوودەتای شێخەکانی تەریقەتی سۆفیگەری بە سەر ئاینی ڕاستدا بە لەناوچوونی میرە کوردەکانەوە گرێ دا، چونکە سوننەتی شەرعی پاکیان پاراستبوو (هەموو ئەوانە لە دیوانەکەیدا هەن). نیگاری ئەو زەحمەتییەی کە لەو بوارەدا بەرەو ڕووم دەبووەوە بەوە تەواو بوو ڕاستییەکی تر لە پشت هەموو ئەو ڕاستیانەوە بوو و لەگەڵیشیاندا جیاوازی هەبوو و بە بێ ئەوەش کەس لە حاجی قادر ناگا، ئەوەش ئەوەیە لە شیعرەکانیدا بە وەعزدان وازی نەهێناوە و گرکانەکانی لە واتا نەتەوەییەکاندا نەدەتەقینەوە بەڵکو مەبەستی ئەوە بوو خەباتی چارەنووس ئاڕاستە بکا و هاونەتەوەکانی ئاگادار بکاتەوە و هانیان بدا و پێیاندا بڵێ تا وایان لێ بکا داوای دروستکردنی دەوڵەت بکەون[1] و

---

[1] ( ئەو ئامانجە سیاسییەی کە لە شیعرەکانی حاجی قادردا بەرنامەی بۆ دانراوە و ئەدەبی حاجی لە ئەحمەدی خانی جیادەکاتەوە کە چەند سەدەیەک پێش ئەو بووە و مامۆستای ڕاستەقینەی قوتابخانەی نەتەوایەتی بووە، ئەوەندەی پێی بزانین

لەوەشدا بەرنامەیەکی مەیلەو تەواوی بووە و بە درێژایی سەردەمێکی تەواو لەوە زیاترە لە تاکە کەسێک چاوەڕوان بکرێ. بەو لۆژیکە، حاجی قادر بەر لە هەموو کەسێک ڕووی دەمی لە ناوداران و دەوڵەمەندان و زانایان و سەرۆک عەشرەتەکان و ئەوانە کرد کە چەکیان پێ هەڵدەگیرا چونکە پشت بەوان دەبەسترا و ئەرکی شەڕکردنی ئەو دەمە لە سەر شانی ئەوان بوو. وا دەبینی دوژمنایەتیکردنی حاجی بۆ پایەداران و بەهێز و دەسەڵاتدارە کوردەکان لە چەند لایەکەوە مەحاڵ بووە و بە چەندین بەڵگەی بێ دەمەتەقێ ڕەت دەکرێتەوە. ئەگەر مەسەلەکان بدرێنە دەست عەقڵ و ئارامییەوە، شەرمە هەموو ڕاستییە

---

حاجی قادر یەکەم کەس بووە ئاماژەی پێ دابێ. ڕەنگە ئەوەش ڕاست بێ ئەحمەدی خانی لە ڕووی کرانەوەی بەرەو نەتەوایەتییەوە پێش ئەدیبانی میللەتانی سەردەمی خۆی کەوتبێتەوە. شیعرەکانی، کە گیانی کوردبوونیان تێدا گەش بووخواستی ڕاستەوخۆ و ئامانجی گەیشتنی گەلەکەی هانی دەدا بگاتە پلەی سەروەری و ئاسوودەیی و سەربەرزی. هەست بەو خەمەش دەکرێ کە وای لە کورد کردووە بەختی نەگاتە ئاستی بەختی گەلان و بەوەش دەبێتە خاوەنی فکرێکی ڕەسەن و باوەڕی بەهێزی وا کە لە شیعری شاعیری گەلانی تردا نایبینینەوە لە هەڵکەوتێکی دیاریکراودا لە بارەی نەتەوایەتییەوە دەربڕیبێ. لە شیعری خانیدا و لە کەشوهەوای وەک تراژیدیا و بۆماوەییەکی ناسراوە لە شانازی و مەدح و هەجو و دانایی و شتی لەو بابەتانە. ئەحمەدی خانی لەوەدا گەیشتبووە ئاستێکی پێشکەوتوو کە هەست بە بوونی پەیوەندی بوونی کیانی نەتەوایەتی و پێشکەوتن و سەروەری و بەختەوەری گەلەکەی بکا و مەودای زەمانی نێوان ئەو و خەڵکی سەردەمی خۆی ڕاستییەکی گەورەیە و وای کردووە شیعرەکانی ببنە بابەتی دەمەتەقێیەکی بەرز و بڵند لەگەڵ ناخدا ڕەنگدانەوە لە هەموو بوارەکاندا پەیدا بکا. حاجی قادر وەک شاعیرێکی نیشتمانپەروەری کورد بە هێز و توانا و گورجوگۆڵییەوە هەڵکەوت و جاوی بەو پێداویستیانەدا گێڕا تا نەتەوەکەی بگەیەننە سەرفرازی و لەو بوارەدا بووە شۆڕەسواری هەڵکەوتوو و بە جۆرەها شێواز و بە گەرموگوڕی خەڵکی هان دەدا. هەر بەخۆی بووە مامۆستایەکی سیاسەتمەدار و جێی حیزبێکی سیاسی وای گرتەوە کە بە تیۆری و پراکتیک چەکدار بوو.

مەزنەکان کە ڕۆحێکی بەرزیان لە ئەدەبی حاجیدا پێکهێناوە لەگەڵ هۆکار و ئامانجەکانیدا داپۆشرێ تا ئالایەکی شێوە مارکسی لە جییدا بە دەست منداڵەورتکەی ڕۆشنبیرییەوە وەک کۆلارەی ڕەنگاوڕەنگی کاغەز بشەکێتەوە و دڵی خۆش بکا.

هەستکردنم بە گرانیی تێگەیاندنی ڕۆشنبیری لایەنگر و بێ گومانیم لە نەگۆڕینی باوەڕی تەراویلکانەی شیرینیان لە سەر پەیوەندی حاجی قادر بەوەوە کە پێی دەگوترێ دەرەبەگ، هۆیەک بوو بۆ ئەوەی لە هەر بۆنەیەکدا کە لە توێژینەوەکەدا هەڵکەوێ بابەتەکە بکوتمەوە چونکە دووپات کردنەوەی زۆری هەر بابەتێک لایەنە سەرسوڕهێنەرەکانی کەم دەکاتەوە. لە کۆتایی بەشی سێیەمی توێژینەوەکەدا بابەتێکم بە ناوی (حاجی قادر و دەرەبەگایەتی سەردەمی خۆی) هێناوە و لە لاپەڕە (241)ەوە تا (381)م پێ پڕ کردۆتەوە. گومانیش لەوەدا نییە کە هیچ قەڵەمێکی کورد بەو تێروتەسەلییە بە لای ئەو بابەتەدا نەچووە. ڕێگاش بە خۆم دەدەم بڵێم ئەگەر بۆشاییە چین لە سەر چینەکانی لایەنگریی و ڕووکەشیی ڕای بڕیاردەرانە و دەستکورتی ڕۆشنبیری و شتی تری لەو بابەتانە نەبوونایە کە دەست بە سەر بەرچاوڕوونی و چاوساغیدا دەگرن و فشاریان خستۆتە سەر زۆرینەی ئەو عەقڵە چالاکانەی کە دەستیان بە سەر ڕۆشنبیری کوردیدا گرتووە، هەر دەبوو ئەو چەند لاپەڕەیە و هاوشێوەیان کە بە وردی توێژینەوەیان تێدا کراوە هەبن. بۆ دەستنیشانکردن و ئاشکراکردنی واقیع و سەرچاوە کاریگەرەکانیش، ئەوەندەی پەیوەندی بە حاجی قادرەوە هەیە هاشا ناکرێ کە ڕۆڵی لە فرەوانکردنی بازنەی لێکۆڵینەوە و تاوتوێکردن و ئاشکراکردنی ئەو باسانەدا هەیە کە نووسەری کورد بەرەنگاری دەبێتەوە، جگە لەوەی

کونجی تاریک لە ناو خودی توێژینەوەکەدا ڕوون دەکاتەوە. بەڵام سروشتی ئەو دواکەوتنەی بە سەرماندا سەپاوە و گۆشەنیگامان تەنگ دەکا و دەستی خاوەن مەبەستەکان والا دەکا بۆ دەستگرتن بە سەرماندا و ئەوەی لە ماوەی دەیان ساڵدا ڕوویداوە و چارەنووسی زۆر لە نووسەرانی کورد و پلەوپایە و ناوبانگیانی بە ڕای گردەبڕی قاڵببەستەی بێ دەمەتەقێی جیهانییەوە گرێ داوە و هەموو دەرگایەکی لە سەر هەر بیرێک، بە دەگمەن نەبێ، داخستووە کە بیەوێ بەرگری لە خۆی بکا. هەموو ئەوانە وایان کردووە بۆچوونی من وەک بەڵگەنەویست ببێتە تەوەری پێچەوانە و بزوێنەری قەڵەمی ئەو قاڵبە و هەر یەکەشیان مەبەستێکی هەبێ و لە دەرفەت بگەڕێ تا خۆی بە دەروازەی والای شەعبی و سۆسیالیزم و پێشکەوتنخوازیدا بکا و لە بێخەبەری دڵنیا بێ چونکە ئەوەی هیممەتی ڕێی پێ درابێ و خەونی پێوە ببینێ پەلەکردنە لە کارێکی وەک شکاندنی توینێتی وەک ئەوەی بەرهەڵستیکردنی ئاوەژووکردنەوەی ئەو واتایانە بێ کە لە توێژینەوەکەمدا هاتوون، ئەوەش بەو نیازەی ئەوەی لە جەنگ و شیروەشاندنی شۆڕشگێڕانە و مارکسیدا بەرانبەری، سواری بەلەمی (شەعبی و دیموکراتی) بێ و کراسی عوسمانیان لە بەر کردووە و لە ڕاستیشدا کراسی یوسفە و خوێنی درۆیان پێوە کردووە.

لە سەرەتای ئەو لاپەڕانەدا، بە ئاشکرا بە خوێنەرانم گوتووە ناچارم لە باسی پەیوەندی حاجی قادر بە پیاوماقوڵ و ڕێزدارانی کوردی سەردەمی خۆیەوە لە بەر زۆر هۆ پەل بۆ زۆر لا بکوتم و یەکێ لەو هۆکارانە ئەوەیە لە بارەی دەرەبەگەوە باسی ناشیرین بۆ خوێنەری کورد دێنمەوە کە دەڵێی ئەو باسانەیە لە شەیتان و دێویان دەگێڕنەوە و ئەگەر سەپا و یا سەپێندرا دەرەبەگ لە دەرکردنی کورد لە

بەهەشتی مافی خۆی وەک ڕۆڵی شەیتان نەبووە لە دەرکردنی ئادەم لە بەهەشت و ئەو غەزەبە گەورەیە نییە کە هەموو نەهامەتی و کارەسات و کلۆڵییەکی گەلی کورد دەدرێتە پاڵی و ئەگەر سەدان ساڵ لەمەوبەر هێزێک لە غەیبەوە بە یەک لێدان هەموو دەرەبەگ و بازرگان و ئەهلی غەیب و ئەوانەی بە پێی بۆچوونی نووسەرە (بەشۆڕشگێڕبووەکان) بناغەی زوڵم و بنەمای لادان و کۆنەپەرستین لە ناوبردایە، هەر چارەنووسی کورد بە بێ بوونی ئەوانەش بە قەدەر داوە موویەک گۆڕانکاری بە سەردا نەداهات. با دەریشکەوێ پەیوەندی حاجی بەوانەوە جگە لە دۆستایەتی و ڕێزی بەرابەری هیچی تر نەبووە. دەبێ هەموو ئەوانە بە تێروتەسەلی باس بکەم تا لەم توێژینەوە نەفرەتییەدا چ نارۆشنایی ئەوتۆ نەمێنێ خەڵک بە هەڵەدا بەرێ و بەدحاڵیبوون پەیدا بێ، بۆیە هەر لە واقعی گەلی کوردەوە زۆر شتم کێشا و پیوا و هەمووی بەوەی گەیاندم کە ڕێ نادرێ لە سەردەمی حاجی قادر و سەدان ساڵ پێشتردا چاوڕوانی هەڵوێستی جەماوەری بەرانبەر سەرۆکی عەشرەت و پایەداران بکرێ، شیری مارکسیان لە ڕوویان هەڵکێشابێ کە ئەمڕۆ بە کاڵی و کوڵاوی هەڵکێشراوە و هۆی ماددی و کۆمەڵایەتی و بەرژەوەندی و پێکەوەژیانم باس کردووە کە بێدەنگبوونی هەموو شاعیر و ئەدیب و زانا و خاوەن ڕایەکانی کورد تا کۆتاییەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم تەفسیر دەکا کە ئەمڕۆ پێیان دەڵێین خەتی دەرەبەگی کورد و ئەم بێدەنگییە لایەنگری ئەوان نەبووە بەڵکو وەک بە دوای یەکداهاتنی شەو و ڕۆژ و هاتنی هاوین بە دوای بەهاردا سروشتی بووە و تەنانەت ئەو وەرزێرەی کە تیۆرییەکان لێیان دەوێن دژی خاوەن زەوی بوەستنەوە تا هاتنی حیزبە مارکسییەکان لە ناوەڕاستی چلەکاندا لە دژیان فزەیان نەدەکرد. ئاغاکانی دزەیی بۆ نموونە، بەڵگەیە کە چاکردنی بە پیتترین زەوی

پانایی و درێژایی هەموو کوردستانی گرتەوە کە دەشتی هەولێر و مەخموورە و هەڵوێستی وەرزێر لە ترسەوە نەبوو بەڵکو لەوەوە بوو کە هۆش چ ڕێبازێکی بۆ ململانێی چینایەتی تێدا نەبوو هانی بدا بە موڵککردن ڕەت بکاتەوە کە بە لایەوە ئاسایی بوو. هەر ئەو وەرزێرەش بوو ساڵی 1953 ڕاپەڕینێکی بوێرانەی بەرپا کرد تا لە سەر ئەو زەوییە لانەچێ کە کرابووە موڵکی خەڵکی تر و تەسویەی کۆتایی هاتبوو و بە شایەدی خۆی گەیشتبووە پلەی گردەبڕ، بەڵام کە تراکتۆر پەیدا بوو و خاوەن زەوی پێویستی بە وەرزێر و هەوجارەکەی نەما، بێ ئەوەی گوێ بداتە تەسویە و بڕگەکانی یاسا و ترسی حەپس، ڕاپەڕی چونکە بیری چینایەتی لە دوای شەڕی جیهانی دووەمەوە بە هۆی هەوڵی ڕێکخراوە حیزبییە مارکسیەکان و شیکردنیانەوە بۆیان پەرەی سەندبوو. ئەمە نموونەیەکی ئاشکرایە بۆ ئەوەی هەموو شتێک بە سەردەمی خۆیەوە وابەستەیە و ئێمەی تێدا ژیاوین و لە سەردەمی ئێمەدا بوو و پێش ئەوانە و دوای ئەوانەشمان دیتووە، ئیتر چۆن خەباتی چینایەتی لەو سەدانەدا کە تێپەڕین و بە سەرچوون زندوو دەکەیتەوە و چۆن حاجی قادر و غەیری ئەو بە جۆرە بۆچوونێک دێنیتە قسان کە مێژووی کورد لێی بێبەش بووە و کێشەی ئەویش نەبووە؟

ئەوەی لە بواری فکری سیاسی کوردیدا جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە لە ڕیزی میللەتاندا هەر خۆی خەریکی داهێنانی شتی خەیاڵییە لە مێژووی ڕابردووی خۆیدا و دەهۆڵ و زوڕنای بۆ دەژەنێ و بازرگانی پێوە دەکا و شەڕی لە سەر دەکا و هەر دەڵێی ئەرکێکی حکوومەتی یا بازرگانی وەک قۆنتەراتچێتی دروستکردنی خانوبەرە و پرد و بەربەستی ئاو و شتی لەو بابەتانەی لە سەر شانە و دەبێ لە مێژووی

بەسەرچووی کورددا خەباتێ بۆ وەرزێران دامەزرێنێ کە دوای چەندین ماوە و سەردەم ئەوجا لە دایک بووە و هەڵوێستی وا لە سەر حاجی قادر دەکاتە ماڵ هێشتا بناغەی نەبووە و دێرگەلێ لە مێژوودا دەخوێنێتەوە کە بە دەستی خۆی نووسیونی بۆیە سەردەمی شۆڕشگێڕی لە عیراقدا پەیکەری زل و زەبەلاح بۆ ڕەسافی و کازمی دروست دەکا و سەری خۆشی بەوەوە ناهێشێنێ بیسەلمێنێ پەیوەندی داڕێژراو لە نێوان ئەدەبی ئەوان و ئامانجی وەرزێران و کرێکاراندا بووبێ و قەڵەمیش کۆوە نەبوون تا واتای دژە دەرەبەگایەتی و چەوساندنەوە لە شیعرەکانیاندا بدۆزنەوە و لە ناو نووسەرە عارەبەکاندا کەسێکی جددیم نەدی هەوڵی دابێ دەزوولەیەکی بیری مارکسی لە بەرهەمیاندا بدۆزێتەوە یا شتێ پەیدا بکا پشتگیری بیری مارکسی بکا یا لۆمەیان لە سەر ئەوە بکا کە خەباتی چینایەتی و ململانێکردنی دەرەبەگ و بۆرژوایان پشتگوێ خستووە و کەس نەهات لە ڕێزلێنانی یادی ڕەسافیدا لاوازی ژیانی بدۆزێتەوە، وەک ئەوەی لە کتێبی (ڕەسافی لە نزمیدا)ی جەلال ئەلحەنەفیدا هەیە و دکتۆر عەلی وەردیش لە کتێبەکەیدا (چەند دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی...) باسی کردووە.

شۆڕشی چواردەی تەمموز نەک دەستی بۆ پەیکەری عەبدولموحسین ئەلسەعدوون نەبرد، بەڵکو ئەو ڕووبەرەشی بۆ زیاد کرد کە بۆی تەرخان کرابوو، کەچی دەستی بەرەڵاکان ئەو دیوارە کەڕولاڵانەیان ڕووخاند کە دەنگیان لێوە نەدەهات و هەر ئەوەیان کردبوو کە پەنای ئەوانە خۆیانیان دابوو کە لێی ڕاپەڕیبوون. لە ژیانی ئەلسعدووندا یەک زەرە نییە بخرێتە سەر خەباتی جەماوەری و چینایەتی و ململانێکردنی دەرەبەگ. پێش تەممووزیش شۆڕشی مایسی 1941 کە یەکێ بوو لە ڕاپەڕینە قەومییە جددییەکان بەرانبەر ئیستیعمار، وای بە چاک زانی

پەنایەکی ئاسوودەیی بۆ مەلیک فەیسەڵی دووەمی ئەوسا منداڵ پەیدا بکا و لە ناو هەموو شوێن و ماڵ و پەنایەک، ماڵی (مەلا ئەفەندی)ی لە هەولێر بۆی هەڵبژارد چونکە ماڵێکی پایەدار و ڕێزلێگیراو بووە و کەس بیر لەوە ناکاتەوە دەست بۆ مەلیک بەرێ تا لەوێ بێ و شۆڕشی مایسیش بەو چاوە تەماشای خاوەن ماڵەکەی نەکرد کە خوا پێی داوە، چونکە لە هەولێر و موسڵ لەو دەوڵەمەندتر هەبوون، بەڵکو ڕێزی زانست و ناو و ناوبانگ و دەست و دڵفرەوانییەکەی دەگیرا و هیچ تەماحکارێک بە خەیاڵیدا نەدەهات چاوی تی ببڕێ. ئەرێ سەیر و سەمەرە نییە ڕۆشنبیری کورد لە هەولێر مەرج بە دوای مەرجی لە شۆڕشی مایسی قەومی عارەبی بوێ دەست بە یادی (مەلا ئەفەندی) کوردەوە بگرێ و وازی لێ بێنێ کە لە گۆشت و خوێنی خۆیەتی و شوێنەواری زانستی چاکەی گەورەی وای لە دوای خۆی بۆ بەجێ هێشتووە کە مێژوونووسێکی بەغدایی وەک خوالێخۆشبوو عەباس عەزاوی پێیدا هەڵدەڵێ؟ ئەوجا سەیر نییە سوارەی بواری خۆهەڵنانی مارکسی لە گۆڕەپانی کوردیدا کە هەژارترین گۆڕەپانی دنیایە تێیتەقێنێ و داوا لە مێژووی قوربەسەرمان بکا کە مێژووی عارەب و عەجەم دەستی لێ شوشتووە، حاجی قادر بداتە بەر پێوانەکاری و داوای مەحاڵی لێ بکا لە کاتێکدا گەلی عارەب چاو لەوە دەپۆشێ داوای شتی مومکین لە ژیانی ڕەسافی و غەیری ڕەسافی بکا کە مێژووی لەدایکبوونیان لە مێژووی مردنی حاجییەوە نێزیکە و بەشیان لە سەردەمی شۆڕشگێڕی و جەماوەری هەبووە و هەزاران ئەدیبی عارەب و تورک و فارس و گەلانی زەوی بۆ ئەو بارودۆخە زاڵانەی سەردەمی خۆیان وازیان لێ هێندراوە و بە بیانووی ناشۆڕشگێڕی و ناچینایەتی و ناهەژاریتی و ناموفلیسێتییەوە کێشەیان بۆ بەرزڕاگرتنی شانازی و چاکە و داهێنانیان نەناوەتەوە و ئەمرۆ ڕووسەکان شانازی بە

یادی پیاوانی خۆیانەوە دەکەن و ئەگەر ناوی یەکێکیان بە ناوی یەکێ لە کوردەکان بچێ، مارکسی کورد دەستەسرٍ دەخاتە سەر لووتی تا تووشی هەڵامەت نەبێ ئەوجا پرسیاری هۆیەکی جێی قەبووڵکردن و بەجێ بکا و وای لە (بەمارکسیبوو)ی کورد کردووە هەموو پەیوەندییەکی حاجی قادر و دۆستایەتییەکی لەگەڵ ناودارانی کوردی سەردەمی خۆیدا بسڕێتەوە و لە سەر ئەوەش سوور بێ پەڵەی ناپاکی لەوانە بدۆزێتەوە و دوژمنایەتی لە نێوان ئەوان و جەماوەردا خەلق بکا و هەر دەڵێی مێژوو بەوە نەبێ شەرمەزار دەبێ! ئەگەر ڕووکەشییەکی کوشندە لە تێگەیشتنی دیاردەکان نەبوایە و دروشمە جەماوەرییەکان بە بۆشاییدا نەدرابان و ئەگەر دادوەری کۆمەڵایەتی وا هەبوایە کە سنووری مەعنەویمان بپارێزێ، دەبوو ئەو بەرهەڵستاکارانەی کە (گەورەیی) تاکەکانی ڕابردوومان قەبووڵ ناکەن و بیانوو بۆ کەوڵکردنی گەورەپیاوە کۆچکردووەکانمان دەدۆزنەوە، بە تۆمەتی کوژاندنەوەی ڕووناکایی مێژوومان لە بەردەم دادگادا بوەستن، چونکە ئەوە تاوانێکی بچووک نییە کە ویژدانی میللەتان بە سەریدا تێدەپەڕن بە تایبەتی نەتەوەی کورد کە مێژوو ڕێی نەداوە هۆکاری سەروەری زۆری هەبێ و لە ئاستی ڕازیبوون بە کەمی نێزیک لە هیچ ڕایگرتووە. ئێستاش پێویست بە هەڵوەستەیەک دەکا:

لە بارەی نەفرەتکردنی بەمارکسیبووی کوردەوە لە ڕابردووی میللەتی خۆی و سووککردنی گەورەپیاوانمان، بۆ مرۆڤی کوردی هەستیار جێی ڕامانێکی خەفەتئامێزی بەئازارە کاتێ درک دەکا بیری بە تەتکەوپەتکە هۆکاری شانازی نەتەوەیی دەمرێنێ. پێشتر ڕای بێ پێچوپەنای خۆمم لە بارەیەوە بە خوێنەری کورد نەگوتووە چونکە لە نووسینی کوردیدا کاتی نەهاتبوو و ئەوەی کە بە خۆراکێ دەچێ هرس

بکرێ و لە ئاستی شارستانەتی دیاریکراودا بێ، دوور نییە لە لای کەسێکی دی کەمایەتی بێ. عارەب لە زۆر بواردا دەچنە ناو بابەتی شانازییە مێژووییەکان و کۆمەڵایەتییەکانی خۆیانەوە و گوێ بەوانە نادەن پێوانەکاری بۆ سەروەری ئاوەژوو دەکەنەوە و چاوەڕوانی کەسیش ناکەن جورئەتی گەیشتبێتە ئەو ئاستەی هەستی بەڵگەنەویستیان بە درۆ بخاتەوە و لە کەسیش نابوورن پێوەری سەروەری و شانازی لەو تێۆرییانە بخوازێتەوە کە دوای چەندین سەدە لە پێوانەی ڕەسەنی خۆیان پەیدا بووە. لە بەر ئەوە ڕێم هەبوو لە باسی ئازادیدا ڕووی ئەو قسانەیان لێ بکەم کە بۆ کوردم باس نەکردووە و کورتەکەشی ئەوەیە کە کورد لە هەموو مێژووی خۆیدا دەوڵەتی نەتەوەیی نەبووە تا پارچەکانی کۆکاتەوە و بە پێی پێداویستی ژیان و کۆمەڵگە و بەهای کۆمەڵایەتی، تاکەکانی گرد کاتەوە و ڕێساکانی هەموان بگرێتەوە تا گەیشتە ئەوەی چ کەرەسەیەکی پێکگەیشتن و پێکەوەژیان و  گۆڕینەوەی بەرژەوەند پێکەوەی نەدەبەستنەوە و هەرگیز بەرژەوەندییەکی گشتی هەڕەشە لێکراو یا خواستێک ڕاینەپەڕاندبوون. لە سوپادا چەندین سوپا و پلە و پایەی بووە و دوورەکانی لێک نێزیک کردۆتەوە و بە یەکتری ناساندوون و هەموانی خستۆتە سەر یەک ڕێباز بۆ بەدەستهێنانی سوودێک یا بەرپەرچدانەوەی زەرەرێک و ئەگەر بوونی کورد لە وڵاتە گەورەکەی خۆیدا بخەیەتە بن برینکاری و لێکۆڵینەوە و توێژینەوەوە، یەک داوی بەرژەوەندی ماددی دنیایی هەیە کە لە گەلاندا دەبێتە هۆی ئاشنایەتی، هەستی بوونی هاوبەش و گشتییان تێدا فەراهم دەکا، بە هیچ شێوەیەک ئەوە نابینی چونکە هیچ جۆرە پەیوەندییەکی ماددی و بەرژەوەندی لە نێوان بەشەکانی و ناوچەکانی و کەشوهەواکانیدا نابینی کە بە تاڵان، بە سەر داگیرکەرەکانیدا دابەش کراوە و لە بەری هەموو

ئەو پەیوەندییە ماددییانە یەک پەیوەندی ڕۆحی هەیە کە جۆرە پەیوەندییەکی نەتەوایەتی دەستی لی گیر بووە ئەوەش بڵاوبوونەوەی خوێندنی مزگەوتە لە ناوچەکانیدا و ماوەی زیاتر لە هەزار ساڵێکی خایاندوە، لەگەڵ بڵاوبوونەوەی خوێندنی ئیسلامی لە شارەکان و گوندەکانیدا و لە ناو ڕەوەند و جێنشینیدا هەزاران لەوانەی کە پێیان دەگوترا فەقێ لە هەموو کونج و چینێەکەوە پەیدا دەبوون و بە کوردستاندا، لەمسەرەوە بۆ ئەو سەر دەگەڕان تا لە سەر دەستی زانا لێهاتووەکان فێری زانست ببن و بەوەش ڕێگای سەفەر هاوسەفەری ناوچە لێک دوورەکانی پێکەوە کۆ دەکردنەوە و یەک حوجرەی مزگەوتێکیش فەقێی ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا و باکوور و باشووری کۆ دەکردنەوە و بیر و قسە و ئاکاریان دەگۆڕییەوە و هەر یەکەیان دەبووە باڵیۆزی ئەو جێیەی لێیەوە هاتبوو و کە دەشگەڕایەوە بۆ ئەو ناوچەیەی تیایدا دەبووە ئیمام و وەعزدەر، دەبووە باڵیۆزی هەموو ئەوانەی کە تێکەڵاویی لەگەڵدا کردبوون. بەوەش یەک دەماری بەجۆشی هاوبەشی تێگەیشتن مایەوە و جێی هەموو ئەو دەمار و ڕەگە ماددی و مەعنەوییانەی گرتەوە کە لە ژیانی میللەتانی تری خاوەن کیانی سیاسی و ئازاد لە کاروبار و چارەنووسی خۆیاندا لە ژماردن نایەن. لێرەوە و لە ماوەی چەندین سەدەدا، دەرفەتی لەدایکبوونی بەها نەتەوەییەکان کە بەرگر و بەرهەڵستە و لە کیانی سیاسی دەکەوێتەوە، لە دەست کورد دەرچوو و ئەو پێوەرانەشی لە دەست چوون کە هەڵسوکەتی گشتی پێ پێوانە دەکرێ چونکە ئەو بۆتکەی نەتەوایەتییە نەبوو کە ئەو پێوەرانەی بۆ دەگەڕێنەوە. هەرگیزیش لە ڕابردوودا وای بۆ هەڵنەکەوتووە بە هۆی کەمتەرخەمییەوە لە ئاستی بەها نەتەوەییەکاندا سەرزەنشت بکرێ کە جارێ لەدایک نەببوو، یا بە هۆی هەڵوێستی ئاشکرایەوە لە پاراستنی بەرژەوەند و یەکێتی و سنوور

و پەیمانی گشتی کە هەرگیز بوونیان نەبووە، ناو و ناوبانگ دەربکا. لە بەر ئەوە، بۆ ئێمەی کورد بووە مەحاڵ هەستمان لە بەرپەرچدانەوە و پاشەکشێ پێکردنی نێوان دەمی تیغی بەرژەوەندی و کارەساتی نەتەوەییدا ببزوێ و ئەوەش، خەسارەتێکی ترسناکە و لە بواری بەها نەتەوەییە گشتییەکاندا زۆرمان لە سەر کەوتووە و بە قازانجی لەسەر یەکەوە داومانەتەوە و شتێ کە لە قسەکانمانەوە نێزیک بێ کوودەتای لادەرەکانمانە بە سەر ڕێسای خەڵکدا کە لە بوونی نەتەوایەتی گشتیدا بەرجەستەیە: ئێمە لەوەڕگەیەکی بێ پەرژین و گەڕەکێکی بێ چاودێر و بێستانێکی بێ داوڵین[1]...

جا ئەگەر خاکەکەمان بەرژەوەندی گشتی وەهای تێدا نەبوو هەمووان بگرێتەوە، یا ڕەفتاری بەرز و ڕاستی تێدا نەبوو و پێوەرێکمان نەبوو داوای سەرڕاستی لە هەمووان بکا و نەهێڵێ تەرتە و وەرتە بین، لەو نەبونیەدا بەهاگەلێکمان بۆ ماونەتەوە لەو واقیعە دیاریکراوەوە پەیدا بوونە کە تاکەتاکەکانمان تیایدا دەژین، ئەوەش واقعی باوەڕە بە ئیسلامەتی کە لە سەر دەستی پیاوانی ئایین، بێ ئەوەی دەسەڵاتی دنیاییان هەبێ، خۆبەخۆ لە ناوماندا ژیاوە و دەژێ. دەسەڵاتیان مەگەر لە لایەنگری ناودارێک یا سەرۆکی عەشیرەتێک یا دەسەڵاتدارێکی بازنەیەکی بەرتەسکدا هەبووبێ. لە ڕێی پێداویستی ژیان و پێداویستی تاکەکانی خەڵکەوە وەک کرمی ئاوریشم توانییان توێژاڵێکی تەنکی ناوداری و توانای سنووردار بە دەوری خۆیاندا بچنن و لە بازنە بەرتەسکەکەدا ئاڕاستەی بکەن، جا یەکێ بووە زانا و ناوی زانیاری دەرکرد و یەکێ بووە بازرگانێکی پایەدار و باسی سامانەکەی دەکرا و

---

[1] داوڵ: داهوڵ، داهۆڵ، ئەوەی لە ناو بێستان دەچەقێندرێ و پەلەوەر لێی دەترسێ و لێی هەڵدێ. وەرگێڕ.

یەکێ بووە ملّکدار و بۆ بژێو پەنای بۆ دەبرد یا بووە سەرۆکی عەشرەت و عەشرەتەکەی پلە و پایەیان دەپاراست یا بووە شێخی تەریقەت و ناوی بە وڵاتدا بڵاو بووەوە یا بووە سەنعەتکارێک و ناوی دەسترەنگینی دەرکرد و ژیانی بۆ فرەوان کرد و بەوانەش توانییان تا ئاستێکی دیاریکراو بە بەها تایبەتییەکان جێی بەها نەتەوەییەکان پڕ بکەنەوە و ڕێزیان بگیرێ و ڕێزی خەڵک بگرن و هەندێ جار بە دەنگی چاکەخوازییەوە بچن و بەرگری لە دابونەریت و بەهاکانی بکەن، ئەوەشیان لەوەدا بۆ هەڵکەوتووە کە واقیع پێی بەخشیون و بە خۆیان خەلقیان نەکردووە و هەموو خەڵکیش، هەر کەسە و بە گوێرەی خۆی، لێی بەشدار بووە و هەموویان لە بازنە و کەلێنەکانیدا شڵەژان و هەندێکیان نزم بوونەوە و هەندێکیان بەرز بوونەوە و بەشی هەندێ لەوانە پایەداری و دەسەڵات بوو و هەندێکیان ئەوەندە لە بواری چاکەخوازی یا تەریقەت یا بەرچاوتێری یا بوێری یا دەسترەنگینیدا هەڵکشان بوونە مایەی شانازی بۆ نەوەکانی داهاتوویان. کورد هەتا ئێستەش بۆ سوارەکانی مەریوان و زوهدی کاک ئەحمەدی شێخ و هەڵکشانی مەولانا خالید و زانایی ئیبن ئادەم و ئەدەبی نالی دەهەژێن و داستان لە سەر چاوتێری حەماغا دادەنێن و گۆرانی بە سوارەی عەشرەت و سەرۆکەکانیدا دەڵێن و لێرە هەندێ بەیت لە سەر چاوتێری ئەم و لەوێ هەندێکی تر لە سەر بەخشندەیی ئەو دەڵێن و ڕەنگە کورد لە شانازی و خۆهەڵنان بەوانەوە، بەرانبەر ناکورد بگرێ و توانیویەتی ئەو تاریکییەی کە مێژوو بە سەرمانیدا داوە، بە دەقی پەرشوبڵاوی سەردەمەکان و شوێنەکان ڕووناک بکاتەوە و شانازی بەهای ناوچەیی جێی شانازی بەها نەتەوەییەکانی بۆ گرتۆتەوە و خەڵک بۆیان هەبووە بژێن و دڵی خۆیان بە چاوتێرێک خۆش بکەن کە تیایاندا هەڵکەوتووە و ئەوەش نموونەی دڵخۆشییە بۆ هەموو

نیگاساغێک و ژیان لە بوارە جیاوازەکاندا، بێ ئەوەی پلانی بۆ دانرابێ یا پەیڕەوکردنی بە زۆر سەپابێ، بۆیە تیایاندا هەبووە پێکابێتی و هەبووە بە هەڵەدا چووبێ، هەبووە هەڵە بووە و هەبووە دادپەروەر بووە، هەبووە توندوتیژ بووە "طرائق قددا" و ئەوەش لە بارودۆخی گەلێکی وەک کورددا چاوەڕوانی لێ دەکرێ کە پارێزگاری نەتەوایەتی نییە و دەسەڵاتی ناوچەیی لە کوڕانی خۆی نییە، کەچی لەگەڵ بارودۆخە خراپەکەشیدا پێشوازی لە خراپەکاری نەکردووە و بە زاڵمیدا هەڵنەداوە و بە دەنگی فیتنەکارییەوە نەچووە و ئەگەر شتێکی وەهاش ڕوویدابێ نائاسایی بووە و هەموو خەڵکی نەگرتۆتەوە و بە خۆشحاڵییەوە پێشوازی لێ نەکراوە. مەبەستم ئەوە نییە بڵێم بوونی دەسەڵاتی خۆجێیی گەلان و نەتەوەکانی تر تەنها سەرچاوەی خێروبێرە یا بەرپەرچدانەوەی شەڕە، بەڵکو ئەوەیە کە پێی دەڵێن "ئاستی یەقین" لە چاکەی ڕێژەیی گەلێکی داگیرکراو چونکە دەسەڵاتدار لە هەردوو بارەکەدا هەیە و هەستپێکراوە و بەختی کورد لە هەموو مێژوودا ئەوە بووە هەرە خراپ و کەمترین چاکیانی بووبێ، ئەوەش دەسەڵاتی بێگانەیە کە بۆی حەڵاڵ بووە.

کەواتە پەرژینی کیانی نەتەوەیی بە دەوری مێژووەمانەوە نەبووە تا کۆمان بکاتەوە و بەرگریمان لێ بکا و بە بێ کەرەسەی بەرزبوونەوە و ڕەهابوون لە کۆتی دیلێتی ماینەوە و چاومان وەها کورتبین بوو نەدەگەیشتە سەروەری دەسەڵات و ڕەتکردنەوە، لەوەشەوە و لە گوتەی پێشینان و حەکایەتەکانەوە دیارە کە جگە لە هەندێ ناوچەی دیاریکراو، بوونی گشتیمان نەبووە. گوێت لە قسەگەلێک دەبێ کە لە کوردی و ناکوردییەوە هاتوونە و لە کۆنەوە بۆمان ماونەتەوە، ئەوەش لە سەر زەمکردنی کورد و ئازار پێگەیاندنی، بەڵام پێچەوانەی ئەوە کە

پەیوەندی بە بوونی گشتیی کوردەوە هەبێ نابیستی. بێگانەی دەسەڵاتدار ئەو قسانەیان بە سەرمانەوە کردە بیانوو بۆ ڕەتکردنەوەی هەموو داوایەکی تازەمان کە سەردەمی ڕووناکایی بە ڕووی هەموو دنیایدا کردوویەتیەوە و کاریگەرییەکەشی لە بازنەی گوتە چووە دەرێ و کردیە بیانوو بۆ هاشاکردن لە مافەکانمان و حوکمی زاتی کورد لە عیراقدا ئازاری پی دەگەیەنێ و لە عارەب و کورد بە زیادی دەزانێ گوایە دەبێتە کەلێنێک و گەردەلوولی نائارامی لێوە هەڵدەکا...

پێشوازیمان لەم سەردەمە کرد کە پڕە لە ڕاپەڕین و هەندێکیان سنووری مافی نەتەوایەتییان بەزاندووە و بوونەتە مافی کۆمەڵایەتی هەمەجۆری هەندێ ئارام و دەمێ توندوتیژ، دوای بیستوشەش سەدەی کاولبوون و وێرانکاری کە دەستی کوردی لەوەدا بەستووە پردێک لە سەر بچووکترین ڕووباری خاکی خۆی هەڵچنێ و هەردوو بەری پێکەوە گرێ بدا و بە دوای ئەوەشدا هەموو خواست و داوایەکی ماددی پێویست، بە خەیاڵ و شێتایەتی و کەمالیات دادەنێ و بە جۆرەها بیانوو و بەربەست لیکی کوردی پێ دادەچۆڕێنێ. لە یەکێ لە بابەتەکانی کتێبەکانمدا و لە بەراوردکاری نێوان فیوداڵی ئەوروپی و ئەوەی پێی دەڵێن دەرەبەگی کورد، ئەوەم هێناوەتە بەر زەینی خوێنەرانی میللەتەکەم کە بارۆنێکی ئەوروپی سەدەی چواردەهەم و پێشتریش بێزی نایێ سەگە خۆسەویستەکەی لە ماڵی هیچ سەرەکعەشرەتێکی کوردی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا بەرەڵا بکا و بێزیشی نایێ دیوەخانی هیچیان بکاتە تەویلەی وڵاغەکانی. ئێمە خەڵکانێکین، بە هەژارییەکی ماددی ئاستی ئیفلاسەوە و بە هەژارییەکی ڕۆحی کە گەورەترین بۆشایی تیایدا نەبوونی شانازی نەتەوەییە، گەیشتینە سەردەمی بەرهەم و شۆڕش و ئەو وێنە و

بەراوردکارییە گشتییە کۆنانە بزرن جگە لە هەندێ دەگمەن کە وای لە تاکەتاکەی کورد کردووە سەریان بگاتە ئاستی شانی خەڵکە دەستەکانی نەتەوەکانی تر. خۆ ئەگەر شیرپەنجە[1] جەستەی نەخۆشێکی گرتەوە، ئارایش و جوانی نینۆکە سڕەکانی دەست و پێی و جوانکردنی برژانگی پێڵوی چاوە کوژاوەکانی دادی نادەن. ئاگاداریمان لە سەر هەندێ لە میرە کوردەکان کە پلەوپایەی بەرزیان بووە و هەڵکشاون و گەیشتوونەتە ئاستی بەرزی سوڵتان، بەوە ئازارمان پێ دەگا کە بە هۆی پاشکۆیی هەندێ لە دەستوپێوەندە ناکوردەکانی سوڵتانەوە بەوە گەیشتووە و لەوپەڕی بەهێزیدا بە هۆی خەڵکەوە بەهێز بووە و لە لوقمەیەک تێر بووە کە هی خۆی نەبووە. لە ناو گەلاندا دەگمەن میللەتێکی وەکوو کورد هەبێ مێژوو هاویشتبێتیە سەر باسوخواسی پشت ئەستوور بە زانست و هێز و ڕەتکردنەوە بێ ئەوەی خۆی هێزێکی بۆماوەیی هەبێ و هاوکارییەکی لە دەرەوەی خۆیەوە پێ بگا و دەوروبەری بە ورەڕووخاندن گیرابێ و بەهێزەکانی خۆی دابەزێنێ، بۆیە سەیر نییە شاعیری کورد لە کۆتایی بیستەکاندا ببینی شانازی بە میدیەکانی باپیرانیەوە بکا کە دووهەزار و شەشسەد ساڵ لەوەپێش هەبوونە، چونکە وەک هەژارێکی نەدار وایە کە شانازی بە ژەمە خۆراکێکەوە بکا لە جەژنێکی ڕەمەزانی سەردەمی باوکیدا خواردوویەتی... هەندێ بەیتی شیعری حەماسی شانازی بەوەوە دەکەن کە سەر بە میدیەکان و (کەیخەسرەو)ین و ئەوانەش هەزار ساڵ بەر لە هاتنی ئیسلام ڕۆیشتوون و جێی مارسدسی کوردیان گرتۆتەوە و

---

[1] من شیرپەنجە بە ڕاست دەزانم نەک شێرپەنجە و مەبەستیش لە شیر شمشێرە نەک شیری گوانی شیردەران... وەک ئەوەیە بڵێین: خەنجەرپەنجە. پەنجەی شێر چ لێکچوونێکی لەگەڵ ئەو نەخۆشییەدا هەیە؟ ئەگەر چنگی شیر یا چڕنۆکی بوایە، ڕێی تێ دەچوو، بەڵام پەنجەی نا. (وەرگێڕ).

هەتا ئێستا بە گەرموگوڕی دەیلێینەوە.. ئەی نەوەکانی یەعروب! کاتێ لە بڵندگۆی (الحریە)ی تەمموزی 1960ەوە ڕووی قسەم لێ کردن و گوتم: (لە ڕۆژی شەهیدبوونی شەهیدانماندا ناویان بەرن چونکە ڕۆحمان تینووی وشەی دڵنەواییە و چۆن دیاری جوان فرمێسکی منداڵی یەتیم ڕادەگرێ، ئاوها برینمان سارێژ دەکا. شانازی و سەروەری و جەژنەکانمان بەرز ڕاگرن چونکە ئێمەش وەک ئێوە بەشەرین و حەزمان لەوەیە کەرامەتمان پارێزراو بێ و لە بەرانبەر چاکەدا چاوەڕوانی چاکەتانین: "ئەگەر سڵاوتان لێ کرا، وەڵامی چاکتری بدەنەوە یا هیچ نەبێ وەکی خۆی") بەوەدا تەعبیرم لە ویستێکی بەئازار دەکرد تا دان بە بوونماندا بندرێ. بوونێک، پێش ئەوەی شیری بدەینێ شیریمان خواردووە و وەک منداڵێک دەم بە دوای گۆیەکدا بگێڕێ شیر و سۆزی لێ دەستکەوێ. ئێمەی کورد، نێزیکترین بارودۆخمان لە حەقیقەتەوە ئەوەیە موفلیسی نێوان دەوڵەمەندانین، کەمئەندامی ناو پاڵەوانانی ئۆلۆمپیادین، لاڵی ناو خوتبەدەرانین، دەستوپێ بە کۆتی ناو چەکدارانین و خواستی ژیان پاڵمان پێوە دەنێ بەرەو هەر شتێ بچین بۆ ژیان دەستمان بگرێ و ئاساییە شانازی بە شاسواران و قارەمانان و هەموو ئەوانەوە بکەین لە بەر هەر هۆیەک بووبێ لە ناوماندا هەڵکەوتبێ و بە پێوانەی ڕۆژگاری خۆی ناوی چاکەی دەرکردبێ و کەسمان لەو پێوانەیە لا نادەین و حاجی قادریش بەر لەوەی نەوەی ئێمە پەیدا بووبێ بە دەیان ساڵ، لەوەدا پێشرەو بووە. سڵاو بۆ یادی شاعیر و ئەدیب و پیاوماقوڵ و سەرکردە و میرە مردووەکانمان دەنێرم هەر وەها ئەوانەش کە بە ڕاستەڕێدا ڕۆیشتن و کەس گومانی نەبوو ئەوەی حاجی گوتوویەتی جێی ڕەخنە و هاشاکردن بێ و بۆ ئێمەش بۆتە ئەو هەناسەیەی بەردەوام هەڵیدەمژین و لە باوەڕ و کەلەپوور و دابونەریتێکی بۆمان

ماوەتەوە هەر جێی ڕەزامەندی نییە بەڵکو جێیەکی پیرۆزی گرتۆتەوە چونکە ئەو ڕێزەی لە زندووی شایستەی ڕێزلێنان دەگیرێ لە دوای ئەوەی هەیبەتی مردن بە سەریدا زاڵ دەبێ پەرە دەسێنێ و تێکەڵی سەرەتاکانی پەرستن دەبێ و سامێکی دەداتێ کە لە واقیعدا نییە و تارمایی مەزنێک ئەگەر ساڵانی دوای مردنی لە خەڵکی دوور خستەوە، بۆ ئەوانەی خۆشیان دەوێ ناسکتر و ڕوونتر و خۆشەویستترە لەو جەستەیەی دەپژمێ و دەکۆخێ و لەگەڵیاندا دێت و دەچێ و لە ڕێوبانان، جاروبار سەرەسمیش دەدا و ئەوەی زاناکان لە قەومە بە سەرچووەکانی دەگێڕنەوە کە باوباپیرانی خۆیانیان پەرستووە، سەیر نییە. ئێمە خۆشەویستی مەولانا خالید و کاک ئەحمەد و خاڵسی و جەلی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی و قەرەنی ئاغای مەنگوڕمان لە حاجییەوە وەرگرتووە کە بە قسەی خۆی (ئەو خێوەتەن کە تاجەکەی بەر فەلەکی شین دەکەوێ) و ئەمین ئاغا و حەماغاش دوو سەری سەروەریی کۆیەی سەردەمی ئەو و دەیان ناوی دی کە لە دیوانەکەیدا دەدرەوشێنەوە و هەر دەڵێی ئەستێرەی گەشن. ئەوەش چاکەیەکی وایە کردوویەتی، هیچ شاعیرێکی تری پێش خۆی بەو مەبەستە نەیکردووە و بە بوونی ئەو مەزنانە لە ناوماندا دڵمان خۆش بووە و کردوومانەتە بەڵگە بۆ خووی ڕاستمان و بۆ ئەوەش کە ویژدان بە دەمارماندا دێ و دەچێ و هەمووومان بەو شێوەیە ماینەوە و شاعیر و ئەدیبانمان بە دووی یەکدا لەو شێوازەیان دارِشت کە حاجی قادر بە سیی ساڵ و پەنجا ساڵ و زیاتریش بەر لەوان دایڕشتبوو و تا کۆتاییەکانی نیوەی یەکەمی ئەم سەدەیە کە بیری چینایەتی دەستی بە سەر خەیاڵی گەنجان و ڕۆشنبیرانی پلە جیاوازەکانی ڕۆشنبیریدا گرت و لە باوەڕیاندا جێگیر بوو و جێی بە باوەڕ و بۆچوونی تر چۆڵ کرد و ئەوەندەی نەبرد مەیدانی فکری کورد جگە لە مارکسی، باوەڕی تری

تێدا نەما یا بە دەگمەن ما تا وای لێهات لاوان ململانێیان لەوەدا دەکرد زیاتری ئەو (زانست)ە تازەیە بخەنە بواری پراکتیکەوە و توندتر دوژمنایەتی غەیری مارکسیزم بکەن. ڕامالینی مارکسیزم بۆ باوەڕی غەیری خۆی لە گۆڕەپانی سیاسەتی شۆڕشگێڕانەی کورددا تەواو و گشتگر و لە هەموو بوارێکدا بوو و مەگەر بە دەگمەن، دەنا هیچی نەبوارد. تەفسیری ئەوەش جگە لەو تروسکاییەی کە لە مارکسیزم خۆیدا هەیە و بزێوییەکی واشی تێدا هەیە کە بەرەو شتی وروژێنەر پالدەنێ و مژدەی دادپەروەری کۆمەلایەتی و مافی چەوساوان و دەنگدانەوەی خەباتی جیهانی و شتی لەو بابەتانەی تێدان کە بۆ بلاوبوونەوە یارمەتیدەرین، تایبەتمەندی بارودۆخی مێژووییش کە پڕە لە چەوساندنەوەی گەلی کورد بووە سەرباری ئامادەکاری بۆ بلاوبوونەوەی بیری یاخیگەرایی لە هەموو جێیەک. خۆ هیچ کام لە باڵە سیاسییەکانی دژی دەسەلاتی پێش تەمووز لێپرسراوییەکی ڕاستەوخۆی لە بەڕێوەبردنی بەرژەوەندییە گشتییەکاندا نەبوو یا کارێکی وای کردبێ ژیانی خەلکی بەڕێوە بەرێ تا یەک چرکەسات بۆ بەراوردکاری خۆی لەگەڵ دامێنترین دەستووردا بوەستێ یا ئەو بۆچوونەی هەبێ کە بارودۆخی ئابووری بەو سستەمە تێکدەچێ کە بۆ سەلامەتی خۆی لەبار نییە و زۆربەی ئەوانەی پێشڕەوایەتی توندوتیژییان دەکرد ئەرکی خێزان و جلوبەرگ و نیشتەجێبوونیان بە سەرەوە نەبووە و ڕەنگە ڕێی ئەوەشیان بە خۆیان دابێ خێزانەکانیان ناچار بکەن بەرەو نەهامەتی و نەبوونی ڕایکێشن. باوەڕیشیان بەوەی کە دەوڵەمەندی شەرعی بوونی نییە و سەرمایە خوێنی چەوساوەکانە، بەرەو ئەوەی بردبن کە لەدەستدانی بەرژەوەندییان وەک و نەهامەتی و مالوایرانی زیاتر بە لاوە ئاسایی بێ.

بەڵام پێکدادانێک کە ناشێ بە کەمی بزانین، لە نێوان ئایینە نوێیەکە و دوو سەرچاوەی کۆندا ڕوویدا، یەکەمیان هەستی نەتەوایەتییە کە زۆربەی بیرە ماددییە مارکسییەکان تیایدا بنیان ناوەتەوە بەڵام خەسڵەت و تایبەتمەندی و سروشتە بنەڕەتییەکانی خۆی پاراستووە کە بە بێ ئەوانە بوونی نامێنێ و پایە مێژووییەکانیشی پاراستووە کە لە بوونی کوردەوە وەک گەلێکی ناو گەلانی سەرزەمین سەرچاوەی گرتووە و نەکرا بەرانبەر ئەو تەوژمە چینایەتییە جیهانییە ڕیشەکێش بکرێ. سەرچاوەی دووەم ئەو دابونەریتە کۆمەڵایەتییە بۆماوەیە و ئەو بەها ڕۆحییە هەڵڕژاوەیە بەرەو خەڵکی، کە لەگەڵ دارژانیان لە هەناوی دایکیانەوە هەڵڕژاوە. باوەڕە ڕەگداکوتاوەکان یا مەیلەو ڕەگداکوتاوەکان کە بە درێژایی سەدان ساڵ لە سەریان ڕاهاتوون، لە بەر زۆر هۆ کە یەکێکیان باس دەکەین، هەر دەبوو ئەو پێکدادانە ڕووبدا، ئەوەش ئەوەیە کە مارکسیزم خۆی بە پێچەوانەیەکی بەسوود و باشی هەموو فەلسەفەیەکی تر دانا و خۆی لێ بووە ئەو گۆلەی کە سەرچاوە مێژووییەکانی تێ دەڕژێن و ئەوپەڕی کۆتایی پێشکەوتن و پەرەسەندن و گەشەکردنە و هەموو خەسڵەتێکی بەرزە و جگە لە خۆی، هەموو بۆچوون و باوەڕێک هیچ نین ئەوە نەبێ بەربەستن و لە دواکوتوویی کەوتونەتەوە یا دوژمنانی مرۆڤایەتی دەیانخولقێنن. بەڵام دواکەوتویی شارستانەتی و ماددی ناوچە کوردییەکان خۆی لە خۆیدا جۆرە مارکسیەتێکی دواکەوتووتری لە هی وڵاتە پێشکەوتووەکان هەڵدەگرت. هەرچی لە مارکسیزمدا ساغ و باش بێ بە دەستی ئەوانەوە کە پەیڕەویان لێ دەکرد تێکشکا و ئەوەشی بە دەستیانەوە نەشکا لەگەڵ واقعی باوی کۆمەڵگەی کورددا دەرینەبرد کە لە هەموو ڕوویەکەوە لەگەڵ بارودۆخی ئەوروپادا، کە مارکسیزمی تێدا خولقا و گەشەی کرد، جیاوازە. زۆر لە بۆچوونە مارکسییەکان بە شێوەیەک لە

شێوەکان، لە فەلسەفە و ڕێبازی تری ئەوروپادا، کە جێی پەیدابوون و گەشەسەندنیانە، هەن و لایەنە ئیلحادیەکەشی برەوی هەیە و لە بیری ترەوە کە لە پێش خۆیدا هەبوون، وەک بۆچوونێک لە ناو ئەوروپاییەکاندا قەبووڵ کراوە و توندوتیژی تیۆری و بۆچوون و ڕێباز، چەندین سەدەیە ئەوروپای گرتۆتەوە و وەک بەشێکی شارستانەتییەکەیان لەگەڵیاندا ڕاهاتوون. مەسەلەکە لە دەشتی شارەزوور و بتوێن و باڵەک و شوێنانی تری نیوەوێرانی خاکی کوردستان وا نییە و ململانێی باوەڕ، جگە لە مەزەبە ئاینیەکان و تەریقەت نەبووە و شتێکی تێدا نەژیاوە ناوی قوتابخانەی فەلسەفی و هونەری و زانستی پراکتیکی و ئەدەبی سەربەخۆ بووبێ ـ ئەوانەمان لە کوێ بوو!! ئەوانە لە سەر چی بژێن و لە کام ڕۆژنامەدا بڵاو بکرێنەوە و کام کتێب شەرحی بکا و کوا چاپخانە تا چاپیان بکا و کێ دەیانخوێنێتەوە؟! مارکسی کوردی لێرەوە دووقات گەشەی کرد و یەکلایەنە خۆی بە هەموو شتێکدا دا چونکە لە سەر خاکی کوردستاندا ڕووبەڕووی واقعێک دەبێتەوە لە کلۆڵی و سەرەتایەکی بەدبەختانەی وا دایە، ناکرێ تیۆری تەماحکارانە لە خۆ بگرێ، لە لایەکی ترەوە بینای تۆکمەی شارستانەتی ماددی و ئابووری وا ڕووبەڕووی نابنەوە بەرگری لە بەرژەوەندی دنیای خۆیان بکەن و هێزی بەرەو پێشچوونی کەم بکەنەوە. ئەوەی پێی وابێ بەرژەوەندی ئابووری لە خاکی کوردستاندا بەرانبەر چەپگەرایی، چجای کۆمۆنیزم، وەستاوەتەوە هەڵەی کردووە چونکە بەرژەوەندی ئابووری ئەوەندە داتەپیو و دامێن و پاشکۆ و هەڵوەشاوە و کزە، هەرگیز شەرەفی ئەوەی بەرنەکەوتووە بەرانبەر هیچ شتێک بوەستێتەوە و ئەو بەرژەوەند و تەماحە بچووکانەش بە کژی یەکدا چوونەوەیان زۆر لەوە بەهێزترە بەرانبەر بیرۆکەی لەناوبردنیان بوەستنەوە. لایەنگری هەندێ لەو بەرژەوەندییە ئابوورییانە باڵێکی

بەرینی مارکسیە کوردەکانی هەبوو و ململانێی نەیاری دژی بەرژەوەندی خۆیانیان پێ دەکردن و هەردوو لایەنی ململانێکە لەوپەڕی کۆڵەواریدا بوون و لە نەبوونی هیچ جۆرە هەستێکی هاوبەش لە سەرەمەرگدا بوون. قسە لە سەر ئەم باسە درێژە دەکێشێ بۆیە بە سەریدا تێدەپەڕم و دەڵێم بەرەنگاربوونەوەی مارکسیزم بە ناچاری بەرانبەر بنەمای نەتەوایەتی و ورەدا بوو، لە چوارچێوە فرەوانەکەیدا.

نەبوونی کیانێکی سیاسی گشتی لە مێژووی کورددا کە هەموو خاکەکەی بگرێتەوە، دەرفەتی بۆ مارکسیەکان ڕەخساند بەرەو ڕووی بونیادێک ببنەوە ڕەگی ئەوەندە بە زەماندا ڕۆنەچووە بۆیە غیرەتی وەبەر نان بە بوونی کورد بوێرن و دەست بخەنە سەر هەرچییەکی کە نەتەوەیی کورد شانازی پێوە دەکا و ئەو جورئەتکردنەی ئەوان لە هیچ میللەتێکی تردا، ئەگەر بوونێکی دێرینی هەبووبێ و کەرەسەی بەرگریکردنی بەهێزی بووبێ، نەگەیشتۆتە ئەو ئاستە. لێرەوە تەفسیری ئەو شانازییە دەکرێ کە مارکسییە کوردەکان دەیکەن کاتێ (ئێمە کوردین ڕۆڵەی کوردین)یان هەڵگێڕایەوە و کردیانە (ئێمە گورگین ڕۆڵەی گورگین) و دروشمی (مەعاریفی کوردستان)یان تووشی بەدگۆڕان کرد و کردیانە گاڵتەجاڕی (مەعاریفی قلیاسان) و کۆمۆنستە کوردەکان نامیلکەیەکیان بڵاو کردەوە، دەیسەلمێنن مەرجەکانی نەتەوەبوون لە کورددا نییە و مەبەستیشیان ئەوە بوو ئەو بناغە شەرعییەی خەباتی نەتەوایەتی لە سەری دەوەستێ بڕووخێنن و دانیشیان بەوەدا نەدەنا حیزبی شیوعی کورد لە هیچ بەشێکی کوردستانی گەورەدا هەبێ و بە جیا بەرگری لە بەرژەوەندی کورد بکا. ساڵی 1959، کاتێ شیوعییەکی کورد کە یەکێ بوو لەو وەفدە عیراقییەی چووبووە مۆسکۆ ڕاست بووەوە و شێخ لەتیفی کوڕی شێخ

مەحموودی لە سەر ئەوە سەرزەنشت کرد کە ویستبووی باسی هەڵویستی سۆڤیەت لە سەر مافەکانی کورد لەگەڵ خرۆشۆڤدا بکا و ئەوەش وێنەیەکی زندووی نووستنی ویژدانی کۆمۆنستی کوردە بەرانبەر هەر بیرۆکەیەکی (نەتەوایەتی کورد). ئەگەر باسی مافی نەتەوەیەکی تر یا بەرگریکردن بوایە لە  کرێکارانی مەدەغەشقەر، وەک نموونە، بە خەیاڵی کۆمۆنستی کورددا نەدەهات دەنگی نارەزایی بەرز بکاتەوە.

ئەوانە و لە شێوەی ئەوانەی سەر هێڵێکی بەردەوامی پێکدادانی نێوان رەفتاری مارکسیەکان و راپەرینە نەتەوایەتییەکان لە کوردستانی عیراقدا، سەرچاوەیان بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کە هێزێکی ماددی شارستانەتی ئەوتۆی تایبەت بە خۆمان نەبووە تا کیانی نەتەوایەتی دیاریکراو بپارێزین. لە تۆڵەی ئەو شانازییە کە لە دەستمان داوە، لە ناخی بوونی نەتەوایەتیمانەوە شانازییەکی ترمان دەرهێناوە و ئەگەرچی چوارچێوەی بەربەست بە دەورمانەوە نەبووە و بە بەراورد لەگەڵ نەتەوەی تردا کە لە بەر هۆکارگەلێ بزر بوون و لەناو چوون، هێندەی ئەو کارەساتانە وێرانکار نەبوون کە ماوەی دەیان سەدە بە سەر کورددا هاتوون و جگە لە شانازیکردن بە شەرەف و شەهامەت و چاوتێری و بوێرییەوە کە ویژدانمان بەهێز دەکەن و توانای مانەوەمان زیاد دەکەن، شانازی تریشمان خستە سەر ئەوانەوە بەڵام نابێ ریشوە ئاگراوییەکانی ئەو توانایە بگاتە عەسەبی ناحەز کە حسێبی بۆ ناکا و لەو لووتبەرزییەی بەرانبەرمان کەم ناکاتەوە و ناشبێ بۆچوونە پر لە بەرپەرچدانەوەی ئاشکرا بکا و ئەگەر نموونەت لە سەر ئەوە دەوێ پێت دەڵێم ئەگەر خواپەرستێکی گۆشەگیر راستی رێبازی خۆی لە زۆریی زوهدی خۆی لە دنیادا وەرگرێ ناهەمواری تەماح ناخاتە سەر

ئەوەی سوود لە خۆشییەکانی دنیاوە بێنێ بەڵکو دەتوانێ بە تارمایی یاسا و پۆلیس و بەندیخانە لە جێی خۆی ڕایگرێ. نەتەوەیی لەوەدا بە تواناترە وا لە بەرهەڵستکاری خۆی بکا ڕێزی بەها پیرۆزەکانی بگرێ ئەگەر کۆشک و قەڵا و سوپا و دەسەڵات و هێزی سامناکی لە مێژووی خۆیدا پیشان بدا و لە ڕەوتی ڕابردووەوە سروودی داگیرکاری و گۆڕینی دەربار و ملپەڕاندنی بۆ بڵێ و بە گوێرەی دەنگهەڵبڕین و شانازیکردن بە سەروەریەکانیەوە بەرانبەرەکەی سامی لێ دەکا و نەرمیی قسەی بۆش لە پێداهەڵدانی چەوساوەکان و هەڵسوکەوتیانمان زۆر دیتن و دیمان ڕەفتاری خەڵک بەرانبەریان چۆن بوو و باوەڕمان هێنا بێوەیترین شت بۆ ئەوانەی بە زۆر باوەڕ دەسەپێنن هەژاران و نەدارانن و خاوەنی درێژترین سێبەر لە جیهانی مارکسیزمدا ئەوەیانە بە توندترین چنگ ملی خەڵکی گرتووە و بۆ خۆت حسێبی بکە ماوەی چەند ساڵ ملیۆنەها کۆمۆنست ستالینیان پەرست و دوای ئەو خرۆشۆفی چنگنەرم هات و چەند زوو لاکەوت. هەرچۆنێ بێ، ڕۆحی مارکسی کورد ڕێزی قووڵایی مێژوویی کوردی تێدا نییە و لە هەموو بۆنەیەکدا مەودای دەرکەوتنی بووبێ، ئەو ڕاستییەمان بۆ دەرکەوتوە و تا لە ساڵی 1959ی سەردەمی دەسەڵاتی داوود جەنابیدا لە سەرکردایەتی فیرقەی کەرکووک، کە دەستی کۆمۆنستەکانی بەرەڵا کرد تا بە کەیفی خۆیان بکەن گەیشتە ئەوپەڕی و کۆمۆنستی کورد وای لێ هات ئەوەندە سووکایەتی بە هەستی نەتەوایەتی کورد بکا، چەقۆ بخاتە سەر ملی و پێی بلێ (بڵێ کوردم تا سەرت ببڕم ـ جنێو بە کوردستان بدە دەنا سەرت دەبڕم..). بەو نموونەیە کە ڕوونی دەکاتەوە دروشمە نەتەوەییەکان چەند بە لای کۆمۆنستی کوردەوە بێ بەها بوون، کۆتایی بەم لایەنە دەێنم.

بەڵام پێکدادانی مارکسیزم لەگەڵ بەها بۆماوەییەکاندا مەسەلەیەکە لەوە توندتری پێوە لکاوە و لەوە زیاتر تێکەڵی ناوەڕۆکێتی لێی کورت بکەینەوە و بڵێین چاوەڕوانکراوە یا حەتمییە، چونکە ئەو بۆماوەییانە لە دیدی مارکسیزمەوە، لە باشترین حاڵدا سەرخانی مەودایەکی مێژوویی دواکەوتوون و بە جۆرێ بە یەکەوە گرێ دراون بە بێ یەکتر نەبن و پێکەوە پەیدا دەبن و پێکەوە لەناو دەچن و ئەگەر هۆکارێک تەمەنی باوەڕێک دوای لەناوچوونی سەرچاوە ماددییەکەی درێژ بکا، پێویستە لە سەرەڕێی پێشکەوتن هەڵکێشرێ (لەم ڕووەوە باسەکە درێژە و پێویستمان پێی نییە) و لە شێوازە خراپەکەیدا خەیاڵ و پەتی فکرین و عەقڵ و دەست دەبەستنەوە و لە بزاوتن و داهێنانیان دەخەن و پەکیان دەخەن. لەم بۆچوونەدا مارکسیزم هاوبەشی باوەڕی ماددی ترە بەڵام هەڵوێستی بەرانبەریان هەڵوێستی بیر و بۆچوونە و نابێ لەناویان بەرێ و ئەوانەش شتگەلێکن هەموومان دەیانزانین و ئەگەر پێویست نەبوایە باسم نەدەکردن.. بەم باسە کەمە دەست لە مەسەلە بۆماوەییەکان هەڵدەگرم کە مارکسییەکان بۆ خۆپارێزییەکی بێ لزوومی لاوازی بۆی دەچن، بەڵام بۆ ئەوەی لە هەڵوێستمدا لە مەسەلەی لاملیی مارکسیانەی کورد و بۆماوەییەکان ڕوونتر بم شتێ بە کورتی دەگێڕمەوە: یەکێکیان کە ئاشنایەتی لە نێوانماندا هەبوو، پێم گوت ئێوەی خەڵکی سەر بە فەلسەفەی ماددی جەدەلی پێتان شەرم نییە دان بەوەدا بنێن کە حەیوان توانای ئەوەیان هەیە درک بە شتی غەیبی بکەن و باوەڕ بەو باسانە دەکەن کە دەڵێ پشیلە مێیەیەک لە گوندێکی بناری چیایەکی سەر بە بەفر، ئێوارێ دەستی بە گواستنەوەی بەچکەکانی کرد بۆ پەناوپەسێوی ئەوبەری دۆڵەکە و شەویش بەفر هەرەسی بە سەر گوندەکەدا هێنا و هەموو زندەوەرانی تێدا لەناوبرد و سەگێک خەمی کتوپڕ دایگرت و دوای چەند ڕۆژێک خاوەنە

ئازیزەکەی مرد.. بەڵام هاشا لەوە دەکەن ئەو مرۆڤانەی بۆ شەونخوونی و خواپەرستی  و وەرزشی ڕۆحی خۆیان گۆشەگیر کردووە و خۆیان بۆ شتی غەیبی تەرخان کردووە، هەموو باسێکی ئەوان لە بواری کەشف و کەرامەت بە درۆ دەخەنەوە. کەوابێ چۆن لە لایەکەوە بەشەرتان خۆش دەوێ و لەولاشەوە ئەوەی بۆ هەندێ حەیوانی بە ڕەوا دەزانن بۆ گەیلانی و حەللاج بە ڕەوای نازانن. بەوە وەڵامی دامەوە کە هۆیەکە ئەو شەڕ و خراپییەیە کە مرۆ بە دەستی دەجەل و فێڵەوە زەرەرمەند بووە و لە داخوازیەکانی لایداوە. گوتم بیانووەکەتم قەبووڵە بەڵام دانت بەوەدا نا کە لەم بوارەدا مرۆڤێکی سۆزداریت و هەڵیشدەچیت و چ پەیوەندی لە نێوان تۆ و ئەو شتەدا نییە کە باسی دەکەیت، واتە بابەتی و زانستانە، دەنا بە بێ ئەوەی هەستی پێ بکەی دوژمنی مرۆڤیت و هاشا لە تواناکانی دەکەیت و لە دژی مرۆ لایەنگری گیاندارانی تری. دوای هەندێ منجەمنج بێ دەنگ بوو و بێگومان دواتریش گەڕاوەتەوە سەر ئەو باوەڕەی کە لە نێوان هاوەڵەکانیدا باو بوو.

ئەگەر بۆ نەگونجانە بنەڕەتییەکانی نێوان ماددیەتی جەدەلی و بۆماوە نقومبووەکانی ناو غەیب ئەو ڕووکەشە تۆقێنەرە زیاد بکەین کە وەک پێویست تێگەیشتنی دەیان هەزار نیمچە خوێندەواری کوردی مارکسی تەنیوە بە دەستە چوونەتە ڕیزیەوە، بۆت ئاسان دەبێ تابلۆی ململانێی مارکسی کورد بەرانبەر بۆماوە کوردییەکان نێزیک بکەیتەوە و ئەوجا دەبینی لە ئەنجامی ململانێی نێوان ماتریالیزم و ئایدیالیزمی ڕۆژاواییدا تیۆری ماددی هەن لە مەیدانی دەمەتەقێدا جلیتبازی دەکەن بە بەڵگە و بە نموونە دەگەنە ئەنجام و کەمی ئەو زەخیرە عەقڵییە لە لای مارکسی کورد هەیە و بە گوڕەپانی ڕۆشنبیری شۆڕشگێڕی کوردستانی

عیراقیانەوە ڕۆ کردووە تۆمەتی خیانەتکاری کرێگرتەیی و تورەهاتی لەو بابەتانەیان بە زیادەڕۆییەوە داباراندە سەر بەرهەڵستکارەکانیان، لە هەمان گۆڕەپاندا کە لە هەندێ نووسینی (1960)مدا لە بارەیانەوە گوتوومە ئەمانە شیفای ڕق لەوەدا دەبینن هەر سەرێ لە ئاستی برسێتی و نەخوێندەواری و نەخۆشی بەرزتر بێ بیپەڕێنن.

خاوەنی بۆچوونی مارکسی لە مەودا ماددییە موفلیسەکە و بارودۆخی مەعنەوی بێ پشتوپەنا لە کوردستانی عیراقدا بۆیان هەڵکەوت بە سووک و بەکەمزانین و خیانەتکاری لە هەموو کەلەپوورێ بڕوانن بەرانبەر هەر بەهایەکی مەعنەوی مایەی شانازی ئاگریان لێ دەبووەوە و هێرشیان دەکردە سەر ڕابردوو و ئێستا و زندوو و مردووی هەموو شتێکی کە خەڵکی ڕێزیان بۆیان هەبووبێ و گرنگییان پێ دابێ و بە لایانەوە بۆماوەکان وەک هەر بەرهەمێکی مەعنەوی لە حیسابی ئەواندا بەرهەمی دەرەبەگ و چەوساندنەوە بوو. با خوێنەر ئەوانە بە هەڵوێستی گۆرەپانی عارەبی سەردەم بەراورد بکا تا ئەو گوتارەی جەنابی سەرۆککۆماری بە بیر بێتەوە کە لە یەکەم لاپەڕەی گۆڤاری (مەورید)دا بڵاو کراوەتەوە (سەردەمانە بن بە مەرجێ ڕەسەن بن، سەردەمانەبوون قەت ئەوە نییە ڕەگ ببڕیت.. تێگەیشتنیشی ئەوە ناگەیەنێ دەسبەرداری کەلەپووری ڕۆشنبیری مەزنی خۆمان بین) ئا لێرەدا جێی خۆیەتی بەراورد لە نێوان باوەڕی مارکسییە کوردەکان و ئامانجی عارەبە قەومییەکاندا بکەین. بەو پەڕی ساکارییەوە بۆچوونی مارکسییەکان عەقڵی لاوانی کوردیان داگیر کردووە و گەیاندوویانەتە زەلکاو، بەڵام بە گەرموگوڕییەکی زۆرەوە باوەڕیان وایە ئەرکی یەکەمی ئەوان ئەوەیە دەرفەت بقۆزنەوە و هەموو کەلەپوورێکی جێی شانازی و سەروەرییەکی پیرۆز ڕامالن و سەرجەمی ڕابردوویان بە لاوە

لەدایکبوویەکی نارەسەنی دەرەبەگی دواکەوتووە بۆیە بە کەسەکان و دابونەریت و بەهاکانی و حەکایەتەکانیەوە، شەیتانە و دەبێ بەردباران بکرێ.

هەندێک لەوانەیان کە کەمێ ئاستێکی ژیری هەبوو، کەوتنە چالاکی بۆ ڕزگارکردنی هەندێ لەو نموونە و گوتە نەستەقانەی کە لە دیدی مارکسیەوە لەبەر دڵان بوون و ئەوانەیان لە سەرجەمی کەلەپوور و داستانەکانی تر دابڕی و کردیانن بە شوێنەواری (چینە شۆڕشگێڕەکان!)ی کۆمەڵگەی کوردی وەک وەرزێران و کرێکاران، لە کاتێکدا قسەی نەستەق و گوتەی پێشینان و ورە بەرزکردنەوە بەرهەمی چەوسێنەران و خۆژێنەکانن و سەیریش لەوەدایە ئەم قسەیە کە خۆی لە خۆیدا بەرپەرچدانەوەیە، لە دەوڵەتێکی سۆسیالستیدا قەبووڵ کرا و خاوەنەکەی شەهادەی کاندیداتی پێ وەرگرت، چاکتریش وابوو بە لێکدانەوەی خۆی ئەوە بڵێ کە درێژ خایاندنی چەوساندنەوە و کڵۆڵی ماوەی هەزاران ساڵ گوتەی نەستەقی ڕەتکردنەوە و شۆڕشیان لە بیری هەژارانی کورد بردبۆوە و گوتەی خۆبەدەستەوەدان و سەرشۆڕکردنیان فێری کردووە و لە مێژووی کۆن و نوێماندا هەتا بڵاوبوونەوەی بیرۆکەی چینایەتی، ڕووی نەداوە کرێکارانی کورد بۆ داخوازییەکی گشتی یا دامێنتر ورووژابێ ئەوەش شتێکی چاوەڕوانکراوە و هەر دەبێ لە ناو گەلێکدا کە هەرگیز خۆی بۆ بە لاداخستنی کێشەیەکی نێوان خۆی و زاڵمەکانی ناوخۆ تەرخان نەکردووە چونکە بێگانەی داگیرکەر زاڵم و زوڵملێکراوی خستوونەتە سەر یەک خەتی کۆیلایەتی و ڕقبوونەوە لە خۆیان. ئەمە دەڵێم تا ئەوە ڕوون بکەمەوە کە هیچ شوێنێکی پانتایی کەلەپوورە بۆماوەکانمان

لە هێرشی مارکسییەکان، ئەوانەی کە دروشمەکانی هەڵدەگرن و ئاستی ڕۆشنبیرییان تەماوییە، نەخەلەساوە.

لێکدووركەوتنی نێوان مارکسیزمی کوردی و هێڵی مێژوویی بوونی کورد کوێرانە هەڵڕژاوەتە ئێستامانەوە، لێکدووركەوتنەوەیەکی تەواوە و ئەو عەقڵانەی کە پڕن لە دەنگدانەوەی شتێکی وەک کودەتا یا وەرگەڕانیان بە سەردا هات کە سەرەوخوار شت دەبینن و چ من و چ غەیری من تاقیمان کردۆتەوە، شتگەلێ توانای ئەو کەسە لە بن دەهینن کە خەون دەبینێ و لەوانەش کە لە بەر چاوی مارکسی بەڵگەی سەرەوخواربوونی دیمەنن دەمەتەقێیەکی گەرمەی ڕاپەڕینی 1948ی نێوان من و یەکێ لەوان بوو کە لە سووککردنی ئەو دابونەریتەی بۆ خەڵک ماوەتەوە ئەوەندە دابەزی گەیاندییە ئەوەی بڵێ دایک و باوک لە کۆمەڵگەی چینایەتیدا بە نیازی دادۆشێن منداڵی خۆیان گەورە دەکەن و ئەو سۆز و خۆشەویستیەش کە هەیانە جگە لە پەراوێزی ناوەڕۆکی دادۆشین هیچی تر نییە. منیش پێم گوت دەبێ بە چ نیازێکی چینایەتی و دادۆشین پشیلە و چۆلەکە و مریشک و مەڕ بێچووی خۆیان بەخێو بکەن و دەبێ کاریگەری ئیستعمار و چەوسێنەر گەیشتبێتە سەر ئەو بەستەزمانانە و فیترەتی ڕاستی تێکدابن!! لە بەشی دووەمی کتێبی (حاجی قادر)دا و لە باسی غەزەل لە شیعرەکانی و ئەو هەوالانەی کە دەماودەم پێمان گەیشتوون، ڕوونتر و زیاتر لە سەر ئەم بابەتە دواووم و قسەم جۆرەها خۆشەویستی تری گرتۆتەوە و باسی ئەوەم کردووە گومانخستنە سەر خۆشەویستی دایک و باوک چ چینایەتێکە و چۆن ئاوەژووکردنەوەی شتێکی لە بەڵگەنەویست بەهێزترە کاتێ خۆشەویستی گیانداری بێ زمان بۆ بەچکەکانی دەبینی ئەوجا ئەگەر گومانم لە خۆشەویستی دایک و باوکم ڕاست بێ چۆن

باوەڕ بە نیەتپاکی سەرۆکی نیقابە و سەرکردەیەکی سیاسی بەرانبەر خۆم بکەم و چۆن سۆزی دایکم بەرانبەرم تاوانبار بکەم کە پاکترین و بێگەردترین شتێکە لە مرۆڤ سەر دەکا و دڵسۆزییەکەی لە دڵسۆزی خاوەنی ئەو قسانە ڕەسەنترە کە لە ئاستی دایکم و خۆم دەمخەنە گومانەوە. هەر لۆژیکێک ئەگەر ڕێزی خۆی بگرێ باوەڕ دێنی کە دایک و باوک ماوەی بیست ساڵ بە نیازی جاینی گۆشت منداڵی خۆیان گەورە دەکەن، بەڵام کەسێکیش لە پشت زەریاکانەوە گوتەکانی خۆی دەنێرێ و خەڵک دەخاتە سەر نالەبارترین و بەتالووکەترین هەڵوێست، جگە لە دڵسۆزی و خۆشەویستی هیچ نیازێکی تری نەبووبێ؟!! دوای ڕاپەڕینەکە، قسەی لەم بابەتانە لە نێوان قسەکەرانی خاوەنی باوەڕی جیاواز لە کۆیە دەکران هەروەها لە بارەی ڕووداوەکانی و ئەوانەی پێی هەستاوون و دروشمەکانی و ئامانجەکانی دەکران و باسی ئەوە دەکرا چۆن نوێنەرایەتی ویژدانی گەلی عیراقی دەکرد نەک لایەنێکی دیاریکراو و یەکێ لە کۆمۆنستەکان (بە گوێرەی هەواڵی دووراودوور زانیومە ئێستا یەکێکە لە سەرانی شیوعییە عیراقییەکان) سوور بوو لە سەر ئەوەی خەسڵەتی چەپگەرایی بە ڕاپەڕینەکە بدا، پێم گوت جەماوەر لە بابەشێخەوە بە عەلەمێکی گەیلانییەوە بەشدارییان لە ڕاپەڕینەکەدا کردووە، بە سەغڵەتییەوە گوتی ئەوە چ ڕاپەڕینێکە عەلەمی عەبدولقادر گەیلانی تێدا بەرز بکرێتەوە! ئەو کەسە هەر خۆی دەیگوت ئەو سەردەمە تێپەڕیوە زانایەک لێرە و شاعیرێک لەوێ لە بواری فکر و سیاسەتدا پێشڕەوایەتی خەڵک بکا {مەبەستی خەڵکی وەک حاجی قادر و پێشڕەوە کۆچکردووەکانی تری بواری هزر و نیشتمانپەروەری بوو} و شۆڕشگێڕیی مارکسی بڵاو بۆتەوە و بەرنامەی زانستی کارکردن دەرکەوتووە... هتد و خوداش دەزانێ کەمترین ڕۆشنایی هزری باوی خۆماڵی کە خەسڵەتی پارێزگاری تێدا بووبێ و

توانای سەرکردایەتی ڕاست و ژیرانەی بووبێ، لەو هاشوهوش و هەرایە باڵاترە کە عەقڵی هەرزەکارانی پڕ لە خەیاڵی مارکسی ئومەمی و چینایەتی لەو بابەتە هەیەتی، کە لە ئەورووپای ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە کەوتۆتەوە و لە باشترین بارودۆخی هاوسەنگی و نێزیکترین لایەنی لە واقیعەوە، یەکجار لە واقعی بارودۆخی وێرانی کوردستان و خەڵکە پرچبژەکەیەوە دوورە و ڕۆژگاریش سەلماندوویەتی، وەک بۆ عەقڵی ئاسایی سەلمابوو، تۆباویەتی ئومەمی و دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاری ئەوەندەیان کار و قوربانی لە گەلی کورد دەوێ زۆر لەوە زیاترە بە ڕاستی خزمەتێکی بەسوودی بکرێ تا بە ئاواتە نێزیکەکانی خۆی بگا، چونکە ئومەمییەت خۆی بە سەر هۆبەی دژبەیەکدا دابەش کردووە و گەیشتۆتە ئەوەی لە ژیانی پێکدا هەڵقژانی مرۆڤایەتیدا بگاتە ئەنجامی سەکۆی ئاوریشمرێژی خەیاڵی ناوەڕاستی سەدەی ڕابردوو. کرژیی فکری لای مارکسیە کوردەکان، لە مەیدانی پراکتیکدا لە ڕۆژی لەدایکبوونیەوە تا ئێستا هەر بە قسریی ماوەتەوە و هیچ ئامانجێکی وەرزێران و کرێکاران و خەڵکی تر لە سەر خاکی کوردستاندا بەدی نەهاتووە ئەگەر بە دەستی ناکۆمۆنستی کورد نەبووبێ و گەورەترین بەرهەمی ئەو بۆتەی کولاندنە فکرییە مارکسییە ئومەمییەی گۆڕەپانی کورد ئەوەیە بە خۆیەوە سەرقاڵ بێ و دەروازەی دەربازبوونی سەیروسەمەرە بۆ ئەو تەنگژانە بدۆزێتەوە کە تێی دەکەوێ و بە دەوری ئەو شێوازە هەمەلایەنانەدا سووڕاوەتەوە تا بتوانێ لە ئاستی پێکگەیشتنی دروشمەکان و واقعی پێچەوانەدا کە بە ناچاری لەگەڵیدا هەڵدەکا لە سەر پێی خۆی بوەستێ و وروژمی واقعی ناوچەیی و پێداویستییەکانی تێکەڵبوون لەگەڵ بزووتنەوەی جیهانیدا بگونجێنێ و بەرەنگاری هەر شتێکی چاوەڕواننەکراویش ببێتەوە کە کتوپڕ بە سەر

بارودۆخەکەدا بێ و چارەسەری ئامادەکراوی لە ئەرشیفی بیری مارکسی کورددا نەبێ.

هەرچۆنێ بێ، ئەو بیرە نوێیە ئەوەی کردە مێشکی لاوانی خوێنگەرمی بێ تەجرەبەوە کە پێوانەی سەردەمی بەسەرچوو و بەها کۆمەڵایەتییەکان، لە کەڕووی بیری دەرەبەگ و بۆرژوای گێل و خزمەتکاری داتاشراوە. تامی ئەوەش لە زاری ئەو گەنجانەی مەراقیان خۆدەرخستن و خۆسەپاندنی خۆیان بوو و بێ کەرەسەی بەرگریکاری لە بیرکردنەوەی دروست و لێکدانەوەی ڕاست بوون، خۆش بوو و جوانترین بیانووش بوو بۆ ئەوەی هەرچییەکیان بە شایستەی ڕووخاندن زانیبێ وێرانی بکەن و هیچ حیسابێک بۆ بەهاکانی ئەو واقیعە نەکەن کە بە لایانەوە ئەو (کەڕوو)ەی لە خۆ گرتبێ و پێوەی پەیوەست بێ و هەموو پەیوەندی و بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی کە کۆمەڵگایان لە سەر هەڵچندرابێ و بە لاکەوتنیان هەرەس بێنێ، بە سەر دانیشتواندا بڕووخێنن. خەیاڵ، ئەوانەی بەوە لە خشتە بردبوو کۆمەڵگەیەکی سۆسیالستی لە ناوچەیەکی ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەتدا دامەزرێنن وەک ئەوەی کوردستانی عیراق گەڕەکێکی بولگاریا بێ یا هەندێ ناوچەی ئۆکرانیا بێ و کەرەسە هەرە لەپێشەکانی ئەو بیرکردنەوەیە وەک ئەنجامێکی بەڵگەنەویستی حوکمە گردەبڕەکان بوو بە سەر مێژوو و بۆماوەکان و بەهاکانیان و ڕووخاندنی ئەو ستوونانەی کە ڕێزگرتنی پێشینان لە سەریان وەستاوە و نەفرەتیش بە سەر دەرەبەگی ئەمڕۆ و سەرمایەداری ئەمڕۆ و غەیبیاتی ئەمڕۆدا داباری تا ڕابردوویەکی دووریان و بە پێی حوکمەکانی ناوەڕاستی ئەم سەدەیە هەموو سەرۆک و سەرکردە و پایەدار و خاوەن سامان و بازرگان و ناودار و مڵکدارێکی پێش سەد ساڵ و هەزار ساڵ و دوای مردنیان

باسی چاکەکارییان مابێ، تاوانبار کران و تۆمەتی (دەرەبەگایەتی و بۆرژوازێتی)یان بۆ داهێندرا تا چاکەیان ببێتە بەڵگەی هیچوپووچی هەر کەسێکی ئەو خەسڵەتانەی لە سەردەمی بە سەرچوودا بووبێ و ئاگری خەباتی چینایەتی خرایە سەر هەموو سەوزاییەکی دوێنێمان بە گیا و داری ئێرە و ئەوێی دەشتی ڕووتەڵانی بوونمان کە خەڵک دڵی خۆیانی تێدا بە ناودارێکی ئازا یا چاوتێرێ یا دینداری یا بە دەنگەوە هاتنێ یا هەر شتێکی تر کە گەلان شانازی بە بوونیانەوە دەکەن کە لە تاکە بەخشندە و شەرەفمەندەکانیدا بەرجەستە بووبێ. بەو شێوەیە مێژوومان بووە بیابانێکی ڕووتەڵان و هەموو بستێکی بۆنی مەرگ و نەهامەتی و بۆشایی لێ دێ و وای لە هەموو ئەوانە کردووە کە لە بوونی خۆیاندا هەست بە کەموکوڕی دەکەن، کەموکوڕی خۆیان بەوە داپۆشن ناوی گەورەپیاوانی مێژوومان لەکەدار بکەن و گۆڕەکەیان هەڵدەنەوە تا نەفرەتی لێ بکەن، ئەوجا هەتا ئەمڕۆیان بەرەوخوار ببنەوە تا هەموو ئەو مرۆڤە زندووانەش تاوانبار بکەن یا نەفرەتیان لێ بکەن یا بەردبارانیان بکەن کە پلەوپایەی کۆمەڵایەتی و ڕێز لە خۆگرتنیان ڕێ نادەن ببنە کەری ئەو هەرزەکارانەی کەرامەتی بوونی نەتەوایەتی خۆیان دەلسنەوە. سەرکەوتنی یەکجارەکی و تەواو بە سەر سەرچاوە شانازییەکاندا بەوە دەگەیشتە ئەوپەڕی تەواوەتی، لایەنی نەرێتی لە کاری ئەرێتی وێرانکارانەدا دەربخرێ: ئەو لاوە عاشقانەی چینایەتی و بەها و پێوەرەکانی چینایەتی نەیانتوانی بە بەهای نوێی شانازی پرۆلیتاریای کوردی کە هیچ مرۆڤێکی تری چینەکانی تری تێدا بەشدار نییە، تۆڵەی ئەو بەها مێژووییانە بۆ خەڵک بکەنەوە کە لە دەستیان دابوون، چونکە کرێکاری دوو جاران داماوی کورد بە درێژایی مێژوو نەیتوانیوە تەنانەت بیریش لەوە بکاتەوە لە چوارچێوەی چینایەتیدا ببزوێ و تا ناوەڕاستی ئەم سەدەیە {پێشتر باس کرا} هەر

بەو شێوەیە مایەوە و هەوڵدان بۆ دانانی پەیکەری کارتۆنی لە گۆڕەپانی مێژوودا بۆ نەوەکانی داهاتوو باسی سەروەری چینایەتی بکا کە هەرگیز لە دایک نەبوو، دەچێتە بازنەی شێتییەوە و مەحاڵە پێش لەدایکبوونی شانازی نەتەوایەتی، شانازی چینایەتی لەدایک بێ. لە ڕاستیدا، بێتوانایی مارکسییەتی هەرزەکاری کوردی لە داتاشینی شانازی چینایەتی لە جێی شانازی نەتەوایەتی لە بەر هۆکارێکی ترە و وەختە هۆکاری یەکەم بزر بکا، ئەوەش ئەوەیە عەشقی هەرزەکاری کورد بۆ ئومەمییەت و قارەمانێتی کرێکارانی بەرەی سۆسیالیزم هەموو تارماییەکی قارەمانێتی کرێکارانی کوردی لە عەقڵیدا زندەبەچاڵ کرد و دووریش نییە لە ترسی ئەوەی بەوە تۆمەتبار بکرێ ڕەگی پیری بۆرژوازییەت لە دەروونیدا هەیە، هەموو شانازییەکی ناوچەیی تەسکی لە خۆی تەکاندبێ. هەوڵی کوردە مارکسییەکان بۆ سەلماندنی بوونی ململانێی چینایەتی لە مێژووی دێرینی کورددا نەیتوانی بەڵگەیەک بەدەست بێنێ قارەمانێتی و ئازایەتی لە کەلەپووری نەتەوەییدا بۆ ململانێی چینایەتی بگێڕێتەوە و تەنانەت نەیتوانی یەک گوتەی پێشینان یا قسەی نەستەق لە گۆرانی و بەیت و بەستەی هەڵپەڕکێدا پەیدا بکا یا لە بالۆرەی کچە عەشرەتیەکاندا کە بە کەرەسەی بەرهەمهێنان و گوڵەگەنم و جۆدا هەڵیانداوە و بە زێڕ و زیویان داناون ئاماژەی وایان نەدیوە، یا باسی کار و کشتوکاڵیان کردووە و ئێستاش ئاوازبێژی کورد، ڕەنجبەر و وەرزێر و کرێکار و مازووچن و بەڕوورن و ڕاوچی دەشتودەر و کێوەکان و ئاوەکان، خەیاڵیان ئاوێزانی بەژنی بەرز و چاوی ڕەش و پرچی داباریوی سەر شانومل دەبێ و هانای ئەوینداری دەبەنە بەر هیممەتی پیاوچاک و نوشتەنووس و شێخی تەریقەت و ئەگەر ئەو خەڵکە موفلیسە لە شەوانی زستاندا بەدەوری حەکایەتخوانی نەزمزان و دەنگبێژدا کۆ ببنەوە گوێ بۆ باسی

ئەوینداری و قارەمانێتی و ئازایەتی و سوارچاکی وچاوتێری ئەوانە دەدێرن کە پرشنگیان بەرەو خواناس و پیاوخاس و ئەو دیندارانە دەڕوا کە ئاگری فیتنەیان کوژاندۆتەوە و دڵی بەئەوینیان لێک نێزیک کردوونەتەوە. ئەگەر لە چیرۆکەکەدا کوڕە هەژارێ شەیدای کیژە دەوڵەمەندێک بووبێ پێکگەیاندنیان لە سەر دەستی پیاوچاکێکی ناودار بووە. لەم بۆماوانەدا، باسێک نیە پەیوەندی بەو شیکردنەوە چینایەتییەوە هەبێ کە دڵی تەفسیرکەرانی مارکسیەکان خۆش دەکا و لە سەر ململانێی توندوتیژی نێوان چینەکان بێ و بە دووی سەرچاوەی شۆڕشدا چووبن و ئەگەر لەو داستانانەدا باسێکی وا بووبێ لە ڕووی ئازایەتی و ئەوینداری و کۆڵنەدان و شتی واوە بووە و بە هیچ جۆرێ پەیوەندی بەمەسەلەی چینایەتییەوە نەبووە.

قسەیەکی تاها حوسێنمان لە بارەی کەفوکوڵی گێڕانەوەکانی چەند سەدەیەکی دوای هاتنی ئیسلامەوە بیستووە کە زۆر لە دەقە لەبەرکراوەکانی سەردەمی جاهیلی دەکاتە هی ئەوانەی هەواڵ و دەقی ئەو سەردەمەیان هێناوەتەوە و توانیویانە بەرگی ئەو سەردەمەیان لە بەر بکەن. ڕەنگە هەندێ لەو ڕایانە ڕاست بن یا ڕاست نەبن بەڵام هەرچۆنێ بێ مەترسی ئەو گێڕانەوانە لەو سەردەمەدا کە باویان بووە، ئەگەر کەرەسەکانی هەبووبن، ڕێی تێ دەچێ سەردەمێک بۆ سەردەمێکی پێش خۆی دایهێنابێ، کەچی دوای تێپەڕبوونی زیاتر لە هەزار ساڵ بە سەر (خەڵەفە سور) و حەمادی حەکایەتخواندا و دوای پەیدابوونی کەرەسەی بەرینبوونی هۆشوگۆش و بڵاوکردنەوە و داهێنان و نووسین و پەرەسەندنی فێڵی سینەمایی سەرکەوتوو، کوردی مارکسی دەبینی ئەوەندە دەستەپاچەیە ناتوانێ بە داهێنانی یەک بەیت بۆچوونە بەرینەکانی بۆ سەردەمی کۆن بگێڕێتەوە و لە بارەی ململانێی

چینەکانەوە یا لە بارەی پیرۆزیی تەڵە و داسەوە لای ئەوانەی بەکاریان هێناون یەک هەواڵ بێنێ یا لە سەر تێکشکانی مەردایەتی و سوارچاکی و خواردەیی لە ژێر باری قورسی نەبوونی و تەماحدا باسێ دابهێنێ. ئەگەر دەشتەوێ هەڵنەبەستن بۆ بەرزیی ئامانجەکان بگێڕیتەوە گوایە لە سەرەوەی هەڵبەستنەوەن، هەر لە سەرەتاوە ئەم لێکدانەوەیە بەوە بەرپەرچ دەدرێتەوە کە مێژوو لە ڕەوتێکی بەردەوامی ململانێی چینایەتی و کاریگەری زێدەبایی و بوونی دژەبەر لە هەموو شتێکدا پێک هاتووە و ئەو شایەدییەش دەدەم ئەگەر کوردی مارکسی بیتوانیبایە یەک بەیتی سەرکەوتوو بخاتە سەر کەلەپوور و بۆماوەکانەوە، هەزار بەیتی ناسەرکەوتووشی لەگەڵیدا دادەنا.. مادام کەرەسەیەکی فۆلکلۆری کە ئاماژە بێ بۆ چینایەتی و دژەبەرایەتی لە گوتەی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردیدا دەست ناکەوێ و هەڵبەستن و داتاشینیش لە توانای هونەریی کوردی مارکسیدا نەبووبن، هەوڵەکان لە نووسینی ئەدەبیدا بە شێوەی ئیددیعاکردنی بێ بنەما و سووربوون لە سەر بوونی شتێ کە تیۆری زانستی پێی دەوێ هەبێ، چڕ بوونەتەوە (دەست بەسەرداگرتنی پێویست) و ئەو نووسەرانەیان کە توانایان هەیە کەوتنە هەوڵدان بۆ لێکدانەوەی دەقی فۆلکلۆری و دەرهێنانی ئاماژەی شاردراوەی چینایەتی، ئەوەش لە تەرازوی تێگەیشتنی ڕاستیدا لادانێکی ترسناکە لە خەیاڵی بوونی ململانێی چینایەتی لە هەموو مێژوودا چونکە ئەگەر ئەو ململانێیە لە واقیع و بواری سوود و بەرژەوەندی بەو شێوە توندوتیژەی کە تیۆرییەکە بۆ ئەوانەی پێ دەوێ کە پێی هەڵدەستن، ڕێی تێ دەچوو و دەبوو بە ئاشکرا لە گوتە پێشینانەکاندا دەنگی بدایەتەوە کە دەیەکی ڕووبەڕووبوونەوە لە سەر ئەو کەسە نەدەکەوت کە قسەکەی دەکرد. ئەوجا ڕووبەڕووبوونەوەکە بە ناوی ئەو کەسە دەبوو کە پێی هەڵدەستا

بەڵام داهێنەری بەیت کە بەرەنگاری نەیارەکەی دەبێتەوە ناوی بە نەزاندراوی دەمێنێ و سەیر و سەمەرەیە بوێری لە مەیداندا شیر هەڵکێشی بەڵام نەوێری یەک وشەی ڕووشێنەر بڵێی. سووکایەتی کردنی ئەو نووسەرانە بە تێگەیشتن و لۆژیک گەیشتە ئەوەی سنووری باو ببەزێنن و شیعری چینایەتی وایان کردە بەڵگەی بوونی ململانێی چینایەتی کورد لە مێژوودا، کە دوای ساڵی 1945 نووسراوە. ئەگەر بە لێشاوی بەڵگەی شیعر و گوتەی نەستەقی دوور لە ململانێی توندوتیژ ڕووبەڕووی خۆیان و ئەو هەوڵەیان ببێتەوە کە بۆ ئەوەی دەدەن ئەو قسە نەستەقانە بە زۆر و بێ هیچ بەڵگەیەک بکەنە موڵکی چینی کرێکار و زوڵملێکراوان، کۆمەڵگای کوردی لە بواری قسەی نەستەق و گوتەی پێشینانەوە دەکەنە دوو بەشی جیاوازەوە لە کاتێکدا بە بەڵگە سەلماوە پێکەوەژیاو و تێکەڵ بوونە هەتا ئەو ڕۆژەی کە ئێمە خۆمان تیایدا ژیاوین[1]. ڕەنگە بتوانی ئەو وێنەیە نێزیک بکەیتەوە کە

---

[1] بە ڕای من، جیاوازی نێوان گوتەی نەستەق و شتە مىللییە بۆماوەکانی تر لایەنی (جیددی)ە کە بە شێوەیەکی گشتی، لە قسە نەستەقەکاندا و گوتەی پێشینانداا هەیە. لە قسەی نەستەقدا بە چەند وشەیەکی کەمی بەهێز چڕ دەبێتەوە و دەبێتە دەفرێک بۆ ئەنجامدانی تاقیکردنەوە یا بۆ ڕاستی بۆچوون لە بارەی شتەکانەوە لە بەر ئەوە لێی دەوەشێتەوە بە پێی بۆچوون ڕێنیشاندەر بێ بۆ چاکە و خراپە و ڕاستی و ناڕاستی. لەبەر ئەوە گوتەی پێشینان پارچەی تاقیکردنەوە و باوەڕهێنانی سەدان ساڵ کۆ دەکاتەوە و بۆی هەیە جیاوازی لە نێوان واتای هەندێکیاندا هەبێ، هەروەها لە داڕشتنیشدا. کۆمەڵگا بەخۆی بیری ئاڕاستەی هەموو شتێ کردووە بۆیە سەیر نییە گوتەی پێشینان مەودای نێوان (کێ دایکی دەخوازێ ئەوە باوکێتی) و (ماڵی زاڵم وێرانە جا ئەمڕۆ بێ یا سبەی) پڕ بکاتەوە. ئەوەش ئاشکرایە سەرجەمی خەڵک لە سەرجەمی سەردەمەکاندا بە زمانێکی دیاریکراو خاوەنی هەموو گوتەکانن و ئەو پەیوەندییە گشتییەی نێوان خەڵک و گوتەکانیش ئەو پێداویستییە بەڵگەنەویستە ڕەت ناکاتەوەکە ئەوەی گوتەیەکی داهێناوە کەسێکی لێهاتوو بووبێ نەک داڕشتنی سەرجەمی جەماوەر و هەر ئەوەندە بەسە لە لایەن

کوردە مارکسییەکان مێژووویان پێ کەوڵ کرد و بەهایان پێ ئاوەژوو کردەوە و نەفرەتیان لە بەخشندە و نابەخشندەی ناوداران کرد و ئەگەر وێنە گشتییەکە وەک خۆی بۆ بەر نیگا ڕوون بووەوە هەماهەنگی تەواوی نێوان پرۆسەی شێواندنی حەقیقەت و ئەو کارە تایبەتییەش ڕوون دەبێتەوە کە کاک (ئاسۆ) و خەڵکی هاوشێوەی ئەو، شانازی بەوەوە دەکەن کە واقعی ڕاستگۆیانەیان لە کتێبەکانی مندا لەناو بردووە و درۆ و داتاشینیان لە جێگەیان داناوە و هیچ کەسێکی خۆشخەیاڵ و مەزەندەپاک و نیەتباش ناتوانێ لە ڕووپەڕی بۆچوونی کوردی مارکسیدا جێی شتی لەوە دامێنتر بکاتەوە کە (العراق) لە بواری خۆدزینەوە لە واقیع و ویژدان و حەق بڵاوی کردۆتەوە و جگە لەوەی ڕاستییەکانی بە پێچەوانەکانیان گۆڕیوە مێژوو ئاوەژوو بکاتەوە و وەها ڕاستی پارچەپارچە بکا نەناسرێتەوە، ناتوانێ بەرەو ڕووی ئەو حەقە گردەبڕە بوەستێ کە من پێوەی پەیوەستم. ئەگەر ئەوەی لەو نووسینەدا هاتووە بەوە بپێوی کە من بۆ پیرۆزراگرتنی حاجی قادر و بەرزی و پاکی ئەو سەلماندوومە و چەندیش لە گەڕان بە دوای ئەو بزربووانەدا ماندوو بوومە کە تەنانەت چاوی وردەوەبووش لێیان بە هەڵەدا دەچێ، تا بگەمە ئەنجامی حەقیقەتی ڕەهای بێ مەبەست و بیانوو، لەو پێوانەیەدا دەبینی ئەوەی ئەو نووسینە داویەتیە پاڵ کتێبەکانم لەو بابەتە قسانەیە بڵێی (نهج البلاغە)ی ئیمامی عەلی بۆ زەمکردنی ئیسلام و پێداهەڵدانی پتەکان و زەلامۆکەکانە یا غەزالی یەکێکە لە بەرهەمەکانی ئیستیعماری فەرەنسی یا شۆڕشی بیست لە داهێنانی ئینگلیزە تا دەسەڵاتی خۆیان لە ڕۆژهەڵاتدا پێی بسەپێنن. بەو خودایە جیاوازی نێوان گوتەکانی من و گوتەی ئەو بەڕێزانە دەگاتە

---

هەموو خەڵکەوە جێی ڕەزامەندی بووبێ و بە ساکاری لە ناویاندا تەشەنەی کردبێ. ئەمەش نهێنی بڵاوبوونەوەیەتی.

ئاستی لایەنە دیارەکانی ئەو مەحاڵانە. جگە لەوەش، بەرهەڵستیکردنێکە، شوێنەواری ڕقێکی تایبەتی قووڵی بێڕەزا، لە قووڵایی و بەرینیدا دیارە چونکە گەرمییەکی زیادی وا لەگەڵ داتاشینەکەدا هەیە، کە خۆبەخۆ لەگەڵ تیۆری داتاشیندا نایاتەوە و ڕەنگە جێی خۆی بێ نیگارێک لە (عەقاد) بخوازمەوە کە هەستی خۆبەکەمزانین چ دەردێک بە سەر دەروونێکدا دێنێ کە لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەدا تووشی خۆبەکەمزان دەبێ و ئەو دڕندەییەی ڕاستەوخۆ لە (شمری کوڕی جۆسەن)دا لەو دەمەدا سەری کردووە کە حوسێنی کوشت و ڕەگی بڕییەوە، بۆ ئەو ڕووبەڕوو بوونەوانە دەگێڕێتەوە کە دوو پیاو لە هەموو بوارێکدا و لە هەموو خەسڵەتێکدا، یەکێکیان لە لووتکە بێ و ئەوی دی دامێن. لای خوادای خۆم هاشا لەوە دەکەم مەبەستم بێ خۆم بە حوسێن بشوبهێنم و جگە لەوەی لە ڕووی ڕوونکردنەوەوە لایەنی سەرکردنی ڕقی قسەهەڵبەستان بۆ کتێبەکەم و ئەو دەقە نووسراوە ڕوون بکەمەوە مەبەستێکی ترم نییە چونکە هەوڵیان داوە بە درۆ و داتاشینی مێژوو ئەو شوێنانە بشێوێنن کە جێی شانازین و بۆ ئەوەشە قسە هەڵبەست بەوە تۆمەتبار بکەم کە خەسڵەتی خراپی ڕقبوونەوەیان هەیە لە بەشەر. لە هەندێ بەشی یەکەمی کتێبی حاجی قادردا گوتوومە کەسێ ئەوەندەی تێدا نەبێ دان بە چاکەی کەسێکی مردووی پێش چەند سەدەیەکدا بنێ و ئەو مردووەش چەند چاکەکار بووبێ نابێتە شەریکەبەشی خۆشییەکانی ئێستای و ڕێگاش نادا زندووەکانی سەردەمی خۆی لە هێز و دەسەڵات و لەزەتە ماددییەکاندا ببنە هاوبەشی، چونکە ئەوەی قسە بە دەم مێژوو و مردووەکانیەوە هەڵبەستێ دیارە بۆ زندووەکان و ئێستاش هەڵیدەبەستێ. لە سەرەتاکانی بەشی سێیەمدا گوتوومە کاتێ لە مەیدانی دادگای مەدەنیدا شایەدێک دەبینین سوێندی درۆ بە قورئان

دەخوا، لە لای خۆمانەوە هەست بە شەرمەزاری دەکەین با ئەو شایەدە بە هۆی بەردەوامبونیەوە لە سەر سوێندخواردنی درۆ ئەو هەستەشی نەمابێ. هەر دەڵێی لەو بارودۆخەدا عەقڵی شاراوەمان دەمانخاتە جێی ئەو درۆزنەوە و لە بری ئەو شەرمەزار دەبین. ئەگەر لە هەڵبەستراوێکی دادگای مەدەنیدا ئەوە حاڵمان بێ مافی ئەوەمان هەیە لە دادگایەکی مێژووییدا چەندین ئەوەندە هەست بە شەرمەزاری بکەین، کاتێ دەبینین درۆ دەکرێ و ڕووداوی وا دادەهێندرێ کە نەبووە و هاشا لە شتی تر دەکرێ کە بووە، چونکە درۆ هەڵبەستن بە دەم مێژووەوە هەمووان دەگرێتەوە و زەرەری لەوە تێدەپەڕێ کە چەند دینارێک بێ و لە حوکمدراو بکەوێ و لەو ماددەیەی کە لە دەعوایەکی مەدەنیدا دەسکاری دەکرێ، ڕاستتر و بەرزترە. باوەڕ بکە هەر ڕاستییەک دەربکەوێ و ڕۆشنایی بخاتە سەر جێی دەجەل و ئاشکرای بکا و پێناسەی مامەحەمەیی دەستکرد لە قاو بدا و هەر کە باسی حەقیقەت بکرێ، قسەهەڵبەستی کورد دەست بۆ گیرفانی دەبا تا دڵنیا بێ ئەوەی تێیدایە ماوە و هەندێکیان دەست لە پایەی کورسیە بەرزەکانیان دەدەن و توانای خۆڕاگری تاقی دەکەنەوە و وا دێنە بەر چاوم بە فووی ناهەقی ڕووناکایی لە ڕووی خۆیان بکوژێننەوە یا تەپوتۆز بە دەوری خۆیاندا بەرپا بکەن یا بڵێسەی دامرکێننەوە. من چاوەڕوانی ئەوە دەکەم کە شۆڕش کوردی سوودمەند وا لێ بکا کە سواری شەپۆلی هەڵخڕاندن بێ و لە هەندێ جێی بەشی سێیەمی حاجی قادردا ئەوە دەخوێنیتەوە کە گوتوومە لەگەڵ بیانووی پانوپۆڕی جەماوەری و هێرشی سەر دەرەبەگ و پایەداران و سەرکردە کوردە مردوو و زندووەکانیشدا، هەمیشە پلەوپایەی بەرز و خێروبێر بەشی ئەوانە بوونە کە لە بنەماڵەی دەرەبەگ و ماڵە دینییەکان و ئەو چینە بوونە کە پێیان دەڵێن

چەوسێنەر. و نەماندی وەرزێرێک بەرز بێتەوە و کرێکارێک فەرمان دەر بکا و هەژارێک خەڵک لەناو بەرێ. یا کاتێ گوتم ئەو کوردە جەماهیریانە فێڵێکی خۆشیان داهێناوە بۆ ئەوەی دەست بە سەر پایەداریدا بگرن ئەوەش بەوەی ڕابردوو بدەنە جەماوەر و گوتیان مێژوو بەرهەمی ئەوانە و پاشەڕۆژیشیان بەوە دانێ کە گوتیان ئایندە مڵکی جەماوەرە و ئێستاشیان بە خۆیان دا تا لە بری جەماوەر تیایدا ڕابوێرن و ئەوەش ڕوونە بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار سبەی بوو بە ئێستا و لەبەر ئەوەی بۆ ئێستا وەکیلی جەماوەرن بەر خۆیان کەوت و سبەینێیەکی تریان بۆ جەماوەر هێشتەوە و ئیدی بەو شێوەیە تا پاشەڕۆژێکی دیار و گوتووشمە ئەو فێڵە خۆشکەڵەیە نوکتەیەکم بیر دەخاتەوە کە دەڵێ دوکاندارێک نووسینێکی هەڵواسیبوو تیایدا هاتبوو ئەمڕۆ بە حازر و سبەینێ بە قەرز. کە سبەینێش دادێ و دەبێتە ئەمڕۆ، دەکەوێتە بەر حوکمی حازرەوە.

ئەم گۆڕەپانە بەرین و جەنجاڵەی بوونی ماددی و مەعنەوی کورد کە نیگاریان جوان کردووە، مایەی خەمی گرانی خەمخۆرانێتی و سەرەتای بەر دیدی بینەرانی ئەو نەهامەتییانەیە کە گەلی کورد تیایاندا ژیاوە و دەژێ بە گوێرەی گەلانی تری خاوەن ڕابردووی بەرزی پڕ لە بەهای ماددی و بەناوەڕۆکی کیانی سیاسی و نەتەوایەتی، سەرتاسەری لە بەر دیدی بینەرانێتی و چ لۆمەی عارەبی قەومی ناکەم کە هەوڵی یەکگرتنەوەی دەوڵەتە عارەبەکان و گەلە عارەبەکان دەدا چونکە ئەگەر بەوە دەنگی لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا کەمیش بێتەوە بە یەک دەنگ کە نوێنەرایەتی سەدوچل ملیۆن کەسی یەکگرتوو دەکا ئەوە بە دەست دێنێتەوە کە بە دەنگی پەرشوبڵاو لە دەستی دەدا.

بەڵام کە کاتی لەبار بۆ ئەوە نەهاتبێ ڕووی قسان لەم بارەیەوە لە عەقڵی کوردی بکەین هۆیەکەی ئەوەیە لە باسکردنی ئەم بابەتە بەئازارەدا بەدگۆڕان بە سەر ئامانجەکانیدا دێ چونکە ئەگەر ئەوانەی ناهەقی شاباش دەکەن بتوانن ئەو پیرۆزییە ئاوەژوو بکەنەوە کە بۆ حاجی قادر هەمە و بیکەنە زیانپێگەیاندنی و داگرتن لە پلەوپایەی، بە لایانەوە ئاسانتر دەبێ بۆچوونی من لەبارەی نەبوونی ڕەهەندی شانازی و پاڵنەری بەرگریکردن لە مێژوودا بکەنە بیانوو بۆ تاوانبارکردنم بە دۆزینەوەی کەمایەتی نەتەوایەتی و دووریش نییە زیادەڕۆیی بکەن و بڵێن ئەوە خەلقکردنی کەمایەتییە و ئەگەر ئەوەشیان گوت جگە لە من کەسی تر بۆی هەڵناکەوێ ئەو هەڵبەستراوە بڕەوێنێتەوە و ئەوەش کاریگەرییەکەی دەستبەجێ نییە چونکە ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە یا حەفتانەی کوردی وا نییە بە کەڵکی ئەوە بێ وەڵامەکانم بڵاو بکاتەوە، لە کاتێکدا زۆر ڕۆژنامە بۆ لایەنەکەی تر هەیە کە بەردەوام داویان لە ڕستندایە و منیش دەبێ پشت بە نامیلکە و کتێبۆکان ببەستم و بە درەنگەوە بڵاویان بکەمەوە.. ئەگەرچی دەشزانم قسەکردن بۆ خوێنەری عارەب لە بارەی شتێکەوە کە زەحمەتە لەگەڵ خوێنەری کورددا بکرێ لە سەر ڕاستی بۆچوون و بیرکردنەوەم شایەدی دادپەروەری بۆ من تێدا دەبێ و ئەو ئاسانکارییە باوەی لای ئێمە بۆ قسەهەڵبەستن و بەدحاڵیبوون و ئاوەژووکردنەوە، لادەکەون چونکە دەشێ خوێنەری عارەبی لێ بە شایەد و دادوەر بگیرێن بەڵام ڕێتێچوونی هەڵبەستن و شێواندن یەکجارەکی لاناکەوێ چونکە ئەوانەی بە لایانەوە گرنگە حەقیقەت لە نووسینەکانمدا بشاردرێتەوە دەزانن خوێنەری کورد بەو نووسینە کوردییانە دەخەڵەتێن کە لەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەدا بڵاو دەکرێنەوە کە وان لە بەر دەستان و مەودای ئەوەشیان نییە تەماشای ئەوانە بکەن کە بە عارەبی بڵاو دەکرێنەوە و حەقیقەت دەخەنە ڕوو و

غەڵەت ڕاست دەکەنەوە، ئەوەش دەروازەیەکی فرەوانە و بە پێی سروشت و بەرژەوەندی لێیەوە دەردەکەون.. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ ئەوە بڵێم کە گوتم و ئەمانەت بگەیەنمە جێ و باشترین شێوەی گەیاندنیش ئەوەیە سەرنجی عارەب و کورد لە یەکگرتنەوەیاندا کۆ بکەمەوە..

نووسین لە سەر باوەڕی من، ئەگەر پەراوێز و لایەنەکانی ڕوون نەبن و ئەو سەرچاوە و جۆگە و لقوپۆیەی هەڵدەڕژێنە ناویەوە نەزاندرێن، ئامانجی خۆی ناپێکێ. بابەتی نووسینیش چەند هەستیار بێ، پێویستی ڕوونکردنەوە بۆ تێگەیشتنی زیاتر دەبێ و باوەڕیش ناکەم لە بواری توێژینەوەی ئەدەبی کوردیدا بابەتێک هەبێ لە گرنگیدا بگاتە ئاستی باسی حاجی قادر چونکە یەکەم ئەدیبی کوردە لە سەردەمە تازەکاندا باسی واتا نەتەوەییەکانی کردبێ و هیممەتی گەلەکەی لە داواکردنی مافەکانیدا بەرز ڕاگرتبێ و داوای ئەو پێداویستییانەی کردبێ کە کورد بگەیەننە یەکەم ئامانجی نەتەوایەتی کە دامەزراندنی کیانی سیاسی تایبەت بە خۆی بێ و بوونی بپارێزێ و ژیانی سەربەرزانەی پێ ببەخشێ. ئەم یەکەمایەتی و پێشەنگایەتییەی لە بواری نیشتمانپەروەری کوردیدا، لەگەڵ ئەوەشدا بالایە و دەیان ساڵ پێش سەردەمی خۆی کەوتۆتەوە، نابێ لایەنی تری کەسایەتی و خەسڵەت و سروشتی، کە هەموویان دەگمەن و سەرسوڕهێنەرن، پەردەپۆش بکرێن. ئەو خەتەش کە حاجی لەو ڕۆژەوە گرتیە بەر کە وەک منداڵێکی یەتیمی بێکەس و هەژار لە گوندەوە چووە کۆیە، بە خۆڕاگری و ڕاستگۆیی و بەجەرگی و لایەنگریکردنی لە هەق لەوە بەرزتر بوون هەر ئارەزوو بن. ڕێزگرتنی خۆی و بێترسی لە هەموو شتێ، لە چاودێریکردن و پەروەردەکردن زیاترن و بە شێوەیەک

دەدرێنەوە پشتگرە ڕاستەقینەکەی کە بە بەڵگە پشتئەستوور بن. پێویستە ئەوەش بزاندرێ بۆچی حاجی قادر لە کۆیە، نەک هیچ شار و گوند و شوێنێکی تری کوردستان، دەرکەوت و کەسی تر لە شوێنێکی تری کوردستاندا هەڵنەکەوت و وەڵامی ئەمەش دوای پەیدابوونی محەمەدی کوڕی عەبدوڵای جەلی (باوکم) کە ئەویش هەر لە کۆیە پەیدا بوو، پێویستتر بوو، کە نموونەیەکی هەڵکەوتوو و سەرکەوتوو و بەجەرگێکی بێوێنە بوو و باوەڕی بە هەق و جیهادی نیشتمانی هەبوو و لە کاروباری دنیادا بۆچوونی ڕوون بوو و بەربەرەکانێی شەعبەدەبازی و قرچۆکی دەکرد و پێش خەڵکی درکی بە بەرژەوەندی و مەترسی دەکرد و هەر بە ڕاستی بەردەوامییەکی سەرکەوتووی حاجی قادر بوو و ئێرە جێی باسکردنی نییە. مادام تەوەری گرنگ لای حاجی زندووکردنەوەی هەستی شانازی نەتەوایەتی بوو لە دەماری گەلەکەیدا و خستنەڕێیان بوو بە ڕێیەکدا بیانگەیەنێتە یەکەم ئامانجی نەتەوایەتی لە هەموو هەوڵێکدا کە دەبێ کورد بیدا، ئەویش پێکەوەنانی کیانێکی سیاسی چارەنووسساز بوو، هەر دەبێ لا بەلای هەموو ئەو بەربەستانەدا بکەینەوە کە نەیانهێشت کورد لە ماوەی پتر لە بیستوپێنج سەدەدا کیانی خۆی بە دەست بێنێ و کیانی سیاسی بۆ گەلانێک جێبەجێ بوو کە لە پەراوێزی دووری ناوچەکە نیشتەجێ ببوون و کە شارستانەتیش بەرپا بوون، کوردستان لە چەقیدا بوو. هەموو ئەمانە و شتی تری پەیوەست بە حاجی قادر، کە تاکێکی یەکرەنگی سەر بە کۆمەڵێک بوو و هەڵگری پەیامێک بوو و دەربڕی زمانی خۆی بوو و هاوسەردەمی ڕووداو و پێش سەردەمی خۆی بوو و لە پێش ژنهێنانی خۆی بەرهەڵستکار و لە ئارامیی یاخی و لە سەروەت و سامان باڵاتر، وایان کرد توێژینەوەکەم نەفەسی درێژ بێ و مەودای دور بێ و بە قووڵاییدا بچێ و هۆکار ڕەچاو بکا و بە ڕێوڕەسمدا بەرز بێتەوە و لەگەڵ

ئەنجامدا دابەزێ و هەموو شت و هەموو کەس بێنێتە زمان و شتێکی حاجی لە دوورەوە فەرق کردبێ دووی کەوێ یا بە شێوەیەک لە شێوەکان پەیوەندی پێوە بکا چونکێ لە ڕۆژی لەدایکبوونی و گەورەبوونی و شوێنوڕێی و شلەژانی ژیانی زۆر شتمان لێ شاراوە بوو و کەمێکی کەمیان ڕوون بوونەتەوە و ئەوەش ئاشکرایە کە زۆربەی ئەوانە پەیوەندییان بە کەسانی ترەوە هەبووە کە هەواڵ و شوێنەوار و بارودۆخی ژیانیان پاراستووە. لەبەر ئەوانە، ئامانج شیرین بوو و هەوڵیش زۆر بوون و هەڵکۆڵین فرەوان بوو و بەراوردکاری زۆر بوون و بۆچوون جیاواز بوون. ڕەنگە لە هەوڵی دۆزینەوەی شتێکدا بمبینی وەک ئەوە بم وێنەی پارچەکراو ڕێکخەمەوە ئەوەش بە جێگیرکردنەوەی پارچەکان و ئەگەر پارچەیەک لە جێی خۆیدا نەبێ دوور نییە چاوی وێنەکە بچێتە تەوێڵی یا وێنەکە سەرەوخوار بێتەوە. ئەگەر ویستیشت نموونەیەکی وا ببینی، ئەمەت دەخەمە بەر دەست: ئەوەی لە شیعری حاجیدا سەپاو و جێگیرە، ئەوەیە لەگەڵ باپیرمدا (عەبدوڵڵا جەلی) لە سەفەرێکدا چوونەتە ناوچەی باڵەکی دەوری ڕەواندز. ئەمە کەی بووە؟ وەڵامی ئامادە یا چارەکە ئامادەش نییە و بەڵکو بە هیچ جۆرێ وەڵامێکی وا نییە وات لێ بکا بە دوایدا نەگەڕێی چونکە نە هەواڵ لە ئارادا بۆ ئەو ساڵە هەیە کە سەفەرەکەی تێدا کراوە، نە شوێنەوار نە ئاماژە. ئەو سەفەری خوێندنەش گرنگی خۆی هەیە چونکە بۆتە خەتێکی جیاکردنەوەی نێوان دوو سەردەمی ژیانی حاجی قادر و کاریگەری لە سەر ڕێڕەو و پێگەیشتنی هەیە (ئەمەم بە درێژی و لە دەیان لاپەڕەدا، لە توێژینەوەکەمدا گوتووە...) چەند دێڕێکی ئەو سەفەرە بۆ توێژەرەوە دەبێتە بەڵگەی بابەتگەلێک کە خەڵکیان سەرقاڵ کردووە، یەکێ لەوانە ئەوەیە کە حاجی لە لای زانای گەورە (محەمەدی خەتێ)ی خوێندووە، کە هەندێ لەوانەی بە

مێژوودا ڕۆچوون پێیان وایە دژی ئیمارەتی محەمەد کۆر پاشای ڕەواندز بووە و گوایە فەتوای داوە شەڕکردن لە دژی لەشکری خەلیفە حەرامە و بەوەش پاشاگەردانی کەوتۆتە ڕیزی سەربازەکانی پاشاوە و لە ئەنجامدا دەسەڵاتەکەی هەرەسی هێناوە. خۆ ئەگەر خەتێ کارێکی وای کردبێ و دواییش چارەنووس حاجی قادری بۆ خوێندن بردبێتە لای و لە نێزیکەوە ئاشنای کاروباری بووبێ، هەر دەبوو لە شیعرەکانی نیوەی دووەمی تەمەنیدا، کە هۆشی بەرەو نەتەوایەتی کرابۆوە و چاکە و خراپەی تێدەگەیشت، باسی کردبا. ئاخر هیچ شتێکی زەرەربەخش و سوودبەخشی لە بواری نەتەوایەتیدا نەهێشتۆتەوە بە هەڵنان یا ڕیسوایی باسی نەکا و دیوانەکەی کە بۆنی ئەو وەهمەی تێدا نییە خەتێی زانای پێ تۆمەتبار بکا یا زەمی بکا، ئەو قسە دەماودەمە دەسەلمێنێ کە هەرچی بووە بە ڕەزامەندی پاشا خۆی بووە. تەنانەت خاوێنی خەتێی زانا لە دیوانەکەیدا بەدی دەکرێ ئەوەش لەوەدا کە پاشای کۆرە مزگەوتی ساز کردووە و پارەی لە زانایان سەرف کردووە و دیارە خەتێ، دوای تێکچوونی پاشا لەگەڵ ئیبن ئادەمدا، یەکەم کەسی ئەو سەردەمە بووە بەری کەوتبێ. ئەوەش ئاشکرایە ئەگەر خەتێ لە پلەوپایەیکدا بووبێ محەمەد کۆر پاشا بە هۆیەوە ناوی چاکەی بەرز بووبێتەوە، لە ڕاستیدا بەرزبوونەوەی ناوی خەتێ خۆشیەتی.. ئەم بابەتە و بابەتی تر کە بۆ کورد گرنگییان هەیە، هی ئەوەن ڕووناکییان بخرێتە سەر تا ڕووداوەکانی ئەو سەفەرە گردەبڕ بسەلمێندرێن. لەبەر ئەوە و بە هۆی گرنگی سەفەرەکە خۆیەوە لە ژیانی حاجی قادردا و لەبەر ئەوەی کەوتۆتە خاکی کوردستانیشەوە کە زانای گەورەی زۆری تێدا بوون دەبوو لە ڕووی بنەما و ڕێڕەو و کۆتاییەوە گرنگی پێ بدرێ و منیش وەک شوێنەوارناسەکان قۆڵم لێ هەڵماڵی و توانایەکی زۆرم لێ سەرف کرد و دوای شوێنپێ کەوتم و

سەرچاوەم لە بەرهەمیاندا پشکنی کە ڕووکەشیان لە ناوەڕۆکیان ناچێ و لێڕوانینی سەرپێیانە پیاو دەگەیەنێتە بێئومێدییەکی تەواو. لە دەستنیشانکردنی ئەو سەفەرە ناوبراوەدا، لە سەرەتاوە ئەو شیعرە هەڵکۆڵدراوەی سەر کێلی قەبری حاجی بەکر ئاغا، کە باپیرە گەورەی بنەماڵەی حەویزییە لە کۆیە و خاڵۆی عەبدوڵڵا جەلیی باپیرمە، شیعری حاجی قادرە و ساڵی کۆچکردنی بە حسێبی ئەبجەدی ساڵی 1270ی کۆچییە. لەوەڕا دەردەکەوێ کە ئەو ساڵە حاجی قادر لە کۆیە بووە و هێشتا بۆ جێیەکی تر نەچووە. بەوەش لەوە دڵنیا دەبین کە جارێ ئەو سەفەرەی نەکردووە کە باپیرم کە لە سەفەری خوێندنەکەیدا هاوڕێی بووە، ئەو دەمە بیست ساڵان بووە چونکە ساڵی 1250ی کۆچی لەدایک بووە و لە شوێنەواری بنەماڵەکەماندا دەزانین کە سەفەری باپیرم لەو پلە خوێندنەدا بووە کە لە خوێندندا پێی دەگوترێ (موستەعید) کە بە دوای سەرەتاییدا دێ و لە ڕووی ماددییەوە دەبێتە مەحاڵ سەفەرەکە پێش ئەو ساڵە کەوتبێتەوە. بەڵام ئەوە لە دیاریکردنی سەرەتای سەفەرەکە چ سوودێک دەگەیەنێ کە زانیمان نابێ ئەو سەفەرە زۆر دوای ساڵی 1270ی کۆچی بووبێ؟ لە هەواڵ و دەنگوباسی باپیرمەوە دەزانین کە نابێ ئەو سەفەرە زۆر دوای 1270 کەوتبێتەوە چونکە بە بەڵگە ئەوە دەزانین ڕووداوی زۆر لە سەرەتای سەفەرەکەوە تا ساڵی 1275 بە سەر باپیرمدا هاتووە، کە سەفەرەکەیان تێدا تەواو بووە و ئەو ڕووداوانەش دوورودرێژن و لە چوار تا پێنج ساڵ کەمتر بەشیان ناکا (ئێرە مەودای باسکردنی ئەوانە نییە). لەبەر ئەوە گونجاوترین کات بۆ دەستپێکردنی ئەو سەفەرە بەناوبانگە لە ژیانی حاجی قادردا کە لە دیوانەکەشیدا بە سوێوە باس کراوە، یەکەم هاوینی دوای وەفاتی حاجی بەکر ئاغایە لە 1270دا. لە بەر ئەوەش دەڵێم هاوین چونکە خوێندکاری زانستە ئاینییەکان بۆ

ناوچە سارد و بەفراوییەکان هاوین نەبوایە سەفەریان نەدەکرد و لە کۆتایی پایزیشدا نەبوایە بۆ ناوچەگەرمەکان نەدەگەڕانەوە و ئەوەش لە شیعری حاجی قادر خۆیدا یەکلایی بۆتەوە کە لە شیعرێکی سەردەمی پیریدا لە ئیستەنبوولەوە، لە نامەیەکی بەنەزمدا بۆ باپیرمی نووسیوە و ئەوەش نایابترین و ناسکترین بەرهەمی هەموو تەمەنی حاجی قادرە و تیایدا باسی سیمای موژدەهێنەری هاوین و مەنزڵگای گەشتیارانی شوێنە بەرز وساردەکان دەکا و ناوی قەندیلیش دێنێ کە دووەم بەرزترین لووتکەشاخە لە کوردستانی عیراقدا. ئەوە نموونەیەکی ئەو زەحمەتیانەیە بۆ دۆزینەوەی لایەنێک لە لایەنەکانی ژیانی حاجی قادر و دەریشکەوت کە دەشێ کەسانی تر کە پەیوەندییان پێوە بووە کەموزۆر زانیارییان لە سەری هەبێ ئەمەش وەک هەر شتێکی تر کە بە خەیاڵدا دێ یا نایێ و پەیوەندی بە ژیانیەوە هەبووبێ و لە توێژینەوەی وەک ئەوەی من کردوومە باسیان دەکرێ. بە وردیی نازانین کەی لەدایک بووە و ئەو باسەی بڵاوە کە گوایە ساڵی 1231 لەدایک بووە، بە بەڵگەی سەلمێندراوی هاشاهەڵنەگر بەرپەرچ دراوەتەوە، یەکێ لەوانە جیاوازی تەمەنی حاجی لەگەڵ باپیرمدا بەو شێوەیە دەبێتە نۆزدە ساڵ کە دەکاتە تەمەنی نەوەیەکی تەواو و بەوەش هاوسەفەرییان بۆ خوێندن، نەک هەر زەحمەت بەڵکو مەحاڵیش دەبێ و بە پێی ئەو تەمەنە هێشتا لە خوێندنی ناوەڕاستی (سیوطی)دا بووە (کە لە لای من ماوەتەوە) و ئەو کتێبەش دوا خوێندنی بەرنامەی سەرەتایی مزگەوتە و بەڵگەکەش لە پەراوێزەکانیدایە کە شیعری حاجییە بە دەستخەتی خۆی و لەو کتێبە ناوبراوەدا تۆمار کراوە و ئەو ساڵەشی تۆمار کردووە کە نووسیویەتی (کۆتایی 1276)ە و مەسەلەی تریش هەن کە پێویست ناکا تێیانکەوین. درێژەم بە باسکردنی ئەو نموونانە دا و دەزانم لە دەرەوەی

جغزی بایەخدانی تۆدایە تا دەریخەم ڕۆچوون بە بوارە نەزاندراوەکانی ئەو لێهاتووە چەند زەحمەتە و هەڵخلیسکان، ئەگەر یەک چرکەسات چاو دابخەیت چەند هاسانە[1] و لە ناوەخندا وەڵامی ئەوەیە کە لە نووسینەکەدا هاتووە گوایە کتێبەکانم بە دەگمەن نەبێ بە لای باسی حاجی قادردا نەچوونە و باسێکی بیرەوەرییانەن و ڕەنگە هەستت کردبێ پەیوەندی نێوان ژیانی حاجی و ژیانی باپیرم چ کەسەرێکە بۆ ئەوانەی لەوسەری دژەبەرێکدا وەستاون کە من لە سەرەکەی تریدام. گردکردنەوەی توانای هۆشەکیش بۆ ڕۆچوون بە ناو ئەو نەزاندراوانەدا و ئەنجامگیری تیایاندا کە کەس لەوانە ناتوانن تارماییەکەی بە بەر ئەو هۆشەی خۆیاندا بەرن کە لە نێوان بژێ و بڕووخێدا گیری خواردووە، لە ڕاستیدا ڕاگەیاندنی دەستەپاچەیی ڕۆشنبیری ئەوانەیە کە لە کونی دەرزییەوە دەڕواننە هەموو جیهان و شیکردنەوەی چینایەتی و هەرچی ڕووکەشێکێ تریان بە دوودا دێ کە دەیانکاتە تەراویلکەی وا هەرگیز لە واقیعدا بوونیان نەبووە. ئەگەر ڕووداوەکانی ژیانی حاجی زنجیرەیەک بووبن لەو نەزاندراوانەی کە بۆ ئاشکراکردنیان وەستام و کەرتوپەرتی گونجاویانم لە تابلۆیەکی ڕوون و دیار و هەماهەنگدا کۆکردبێتەوە کە واقیع دەیسەلمێنێ و تیۆری مەبەستدار پێشەکی بۆ ئەو ئەنجامە دانەناوە کە دەیەوێ لە ئەمڕۆ و داهاتوودا بێتە دی و زمانی ئەوەش دەبڕن کە شتی تر بڵێ و ئەگەر ئەو خواستانەی حاجییان لە سەردەمە جیاوازەکانی تەمەنیدا سەرقاڵ کردبێ و لە سنووری ئەو سۆزە قەتیس نەمابێ کە ئەدەبی سەدەی نۆزدە تا بیستەکانی سەدەی بیستەم پێوەی سەرقاڵ بووە بەڵکو ئەوانەشی

---

[1] بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوە گوتوومە ئەگەر یەک سەرەداو لەو داوانەی کە دەچنەوە سەردەمی حاجی قادر و بە دەستمەوەن لە دەستم بترازێ، وەک ئەوەم لێ دێ گوێ بە بڵندگۆی تەلەفۆنەوە بنێ و خەتی تەلەفۆنەکەش پچڕابێ.

دەمکوت کردووە کە لەوە کەمترن ببنە بەرنامەی حیزبێکی سیاسی خاوەن ئامانجێکی مەزن. ئەگەر بشزانی، ویستوومە تیشکێک بخەمە سەر ئەو گۆشە تاریکانەوە کە هەموو ئەو ڕاستییانەیان تێدان کە لە شیکردنەوە و شێوەی زیدەبایی و دژەبەری دیاریکراوی مارکسیزم یاخین لە ناو خەڵکانێکدا کە بەرگی شیکردنەوەی چینایەتییان پۆشیوە و تیایدا قاڵبیان بەستووە و پێی جەوهەردار بوونە و بوونی ماددی و مەعنەوییان پێوەی وابەستەویە و ئەو هەوڵەم  داوە و ئەوەشم خستە سەری کە بەرژەوەندی گەلی کوردی لە سەر ئەوە بەندە ڕاستییەکانی مێژوو و ئێستا و داهاتووی بخرێتە ڕوو ئەوەش لە ڕوانینی ئازادی ئازاوە کە لە دوای بۆچوونی حازربەدەست بڕیاری کۆتایی و لەقاڵبدراو و بۆچوونی داتاشراو و ڕەهابوونی و تۆش وەک من دیتت توێژینەوە لە سەر حاجی قادر ئەگەر ئامێزی فراوان بۆ هەموو شتێک نەکاتەوە لە خزمەتی ئاشکرابوونی ڕاستی بێ و ناڕاستی ڕەت نەکاتەوە و یارمەتی هۆش بۆ گەڕان نەدا بە کوێرەڕێیە تێکئالاوەکاندا کە دەچنەوە سەر هەزار هەڵدێری ناچینایەتی نائامادە و ناداتاشراو و نادژەبەری و ئامادەی هەڵدێری تری لەو بابەتانە، نە کەڵکی دەبێ نە نرخی دەبێ نە بەڕێز دەبێ نە ئامانج بە دەستەوە دەدا. ئەگەر بە بیری خۆتی بهێنیتەوە چ بوارێکی فکری و کۆمەلایەتی و سیاسی و فەلسەفی و دینی و مێژوویی و هونەری و بواری تر نییە مارکسیزم بۆچوونێکی دژەبەری لە سەری نەبێ ئەگەرنا، دەستەپاچەیی مارکسی کورد ڕاستیەکانی تێدا ئاوەژوو دەکاتەوە و بەرچاو لێڵ دەکا و بەها و بۆچوون دەشێوێنێ و تۆمەتی قورس بۆ ئەوانە ئامادە دەکا بوێرن هاوڕای سەرومڕیان نەبن، بەڵێ ئەگەر ئەوانە بە بیری خۆت بهێنیتەوە قسەکانمان زیاتر و زیاتر دەسەپێن و زیاتر و زیاتر پێویست دەبن. ئەگەر قەڵەم بۆ دەربڕینی بۆچوونێک لە سەر بچووکترین لایەنی

حاجی بە سەر دەفتەردا گەڕا، جگە لەوەی ڕووبەڕووی بۆچوونی ئامادەی سەد ساڵ پێشتر دەبێتەوە چاوەڕوانی تر ناکرێ و ڕووکەشی مارکسیزمی کوردی چارەکە سەدەیەکە لەو ڕووبەڕووبوونەوەیەدا دەیشێوێنێ ئەوەش داد نادا هەرچی نووسەر دەریدەبڕێ خۆی لە خۆیدا ڕاست بێ بەڵکو دەبێ ڕاستی و دروستی لە سەر بابەتی دەوروبەری و پەیوەنددار پەل بهاوێ و بەڵگەی گردەبڕ لە سەر سەرجەمی بابەتەکە بسەلمێنێ و دیاردەی سەپاو و ڕەگداکوتاوی ڕوون بهێنێتەوە و لەو ڕایەی کە دەریدەبڕێ، تاکە ڕێچکەی ڕاست بە تەواوی سنووردار بکا. هەموو ئەوانەش لای کوردی مارکسی کارێ ناکا ئەوە نەبێ بۆچوونێکی گومانلێکراو لە هەستی چینایەتی و لادان و دژایەتی کرێکارانەوە سەرچاوە بگرێ و ئەوەی بە بۆچوونی مارکسیزم نارەواییەکەی سەپاوە هەر ئەو مافەی هەیە و دەبێ هەیبێ چونکە قاڵببەستن لە گۆڕەپانی مارکسیسزمی کورددا لە تەواو تەواوترە و لە کامڵبوون کامڵترە و لە ئاین لەوەوە دوورترە بە خۆیدا بچێتەوە و تاقیکردنەوە لە سەر ڕەهەندی جیاواز بکا. مارکسیزمی کورد لە دەمەتەقێدا لە دین توندڕەوترە و ئیسلام یا لایەنێکی بەرین لە زانا ئاینیەکان دان بە ناسخ و مەنسووخدا دەنێن کە لە قورئاندا هەن و قسەش لە سەر شێوەی نەسخی جیاواز لە نێوان نەسخکراوی ڕەواڵەت و نەسخکراوی حوکم و نەسخکراوی شکڵ کە حوکمی مابێ و نەسخکراوی حاکم کە شکڵی مابێ... هتد و بە تێروتەسەلی قسەیان لە سەر ئەمانە کردووە و لە سێبەری دەسەڵاتی ئیسلامی خەلیفەییدا کە لە سەردەمی ڕاشدەکان گوازرایەوە، بەڵام مارکسی کورد پێی ناخۆشە ڕێ بدا تاقیکردنەوە بۆ ئەزەلیەت و ئەبەدییەتی بکرێ و تەنها بە ڕووی ئەوانەدا داناخرێ لە دەرەوە دەمەتەقێ لە سەر ڕاستی تیۆرییە مارکسییەکان دەکەن بەڵکو باسی میقدارەکەشی زەحمەتە کە ئەوانە

دەریانبڕیوە لە حیزبی بەلشەڤیک و کۆمۆنستە گەورەکاندا مافی قسەکردنیان پێ دراوە و لای ئێمە لە سەر بناغەی بیری ناوچەیی بێ پانایی و هەمەڕوویی، وەک دەمی گوێزان یا مووی (سیرات)ی دیار دۆڵی ئاگر تیژە و ئەوەی پێی بخلیسکێ بەرەو وێرانە و خەسارەت و ئامێزی ئیستیعمار دەڕوا، لە مەیدانی مارکسی کوردیدا تەنانەت لەوەش زەحمەتتر و تەنگەبەرترە و پەیامی کورت و درێژیش لە باسکردنیدا کەڵکی نییە ئەگەر هاودەمێتی ڕۆیشتن لەگەڵیدا بە تاقیکردنەوە لەگەڵدا نەبێ. ئەگەر ڕایەک لە سەر حاجی قادر دەربڕم، خەریکە مەحاڵ بێ بۆچوونێکی مارکسی کوردی حازربەدەستی چینایەتی و دەسەڵاتی دەرەبەگ و شتی لەو بابەتانە نەلەقێنم و ڕەنگە سوودی هەبێ دوو نموونەی بچووک بهێنمەوە: یەکەمیان قسەیەکە لە کاتی توێژینەوە لە بارەی حاجی قادرەوە گوتوومە و بەم ڕستەیە کۆتاییم پێی هێناوە: (حاجی قادر خەرمانی شەرەفمەندی شەقڵ کردووە و کەس ناتوانێ بیشکێنێ) و شەقڵیش ئامێرێکە لە دار دروست دەکرێ و ئێواران جێزی خەرمانی پێ نیشان دەکەن و ئەگەر لێی ببەن شەقڵەکە دەشکێ و خیانەتەکە دەردەکەوێ. کۆمۆنستێکی کورد کە لە ئەندازیاریدا شادەی بەرزی هەبوو ڕەخنەی لێ گرتم و گوتی وشەی شەقڵ بەکار دێنی و دەزانی ئەوە ئامێری دەرەبەگە؟!
نموونەی دووەمیش دەمەتەقێی نێوان ئەدیبێکی کورد و بەئەدیببوویەکی کۆمۆنست بوو لە سەر چۆنیەتی گێڕانەوەی هەموو شتێک بۆ لێکدانەوەی چینایەتی و (ئەدیب)ەکە شیعرێکی کوردی هێنایەوە شاعیرەکەی لە دەست ئازاری ئەوین و بێ ویساڵی دادێتی، کۆمۆنستەکە گوتی دیارە دەسەڵاتی دەرەبەگ و ڕێگەگرتن لە عاشقان بۆ پێکگەیشتن و هاوسەرگیری هۆی ئازار و نەبوونی ویساڵە!! قەت ئەوەی بە بیردا نەدەهات کە وەرزێری کورد حەزیان لە فرەژنییە و

دوو یا سێ ژن دەهێنن و ئەوە لە سەریان گوتراوە کە وەرزێری کورد پارەی  هەبێ یا تفەنگ دەکڕێ یا ژن دێنێ. دەبوو دەرەبەگ دەسەڵاتی خۆی بە سەر وەرزێردا بسەپێنێ بەر لەوەی بێتە سەر شاعیرێکی شارنشین کە نەمانبیستووە دەسەڵاتدار لە دڵداری خۆی دایبڕیبێ تا لە دەست زوڵمەکەی هاواری لێ هەستێ. هەروەها ڕەخنەگر لە وشەی شەقڵ بۆ ئەوە نەچووە کە دەرەبەگ لە هەموو وشەیەکی زمان و ڕەفتاری کۆمەڵایەتیدا هاوبەشی خەڵکە و بەوەش دەبێ ئەو خەڵکە واز لە زمانەکەیان و خوو و ڕەوشتی خۆیان بێنن تا ئەو ڕۆژەی بە سەر ئەو دەرەبەگەدا زاڵ دەبن کە قسە دەکا. خۆ ئەگەر ئەویش نەما، ئەوجا بۆرژوا و ئیستیعمار و... پەیدا دەبن. سەرنجی ئەوە دەدرێ کە کوردی مارکسی بوێرییەکی بێ وێنەی لەوەدا هەیە هەموو شت و واتایەک بۆ چینایەتی بگێڕێتەوە و ئەوجا، لە دەرەوەی مارکسیەت و چینایەتی حازربەدەست لە هەموو کەس ترسنۆکترە و لە یەکێ لە بابەتەکانی کتێبەکانم گوتوومە بە هۆی پەیوەستی بەهێزیەوە بەو سەرچاوە مارکسیانەوە کە لە دەرەوەی کوردستانەوە بە سەریدا دەدرێن و ئامادەیی تەواوی بۆ لاسییکردنەوە هەیە، ئەوەندە ئازایەتی تێدا نییە بڵێ چایە لە قاوە شیرینترە نەک سبەی یەکێ پەیدا بێ و پێچەوانەکەی بڵێ. منیش کە قسان دەکەم و ناچارم باسی شتی گەورە و بچووک و ئاسان و زەحمەت بکەم، بەرەوڕووی ئەرکی ڕوونکردنەوە وەفادارم و مادام زۆربەی ئەوەی کە دەیڵێم بە تەبیعەتی حاڵ بەرەو ڕووی ئەو دروشمە فیکرییە مارکسییانە دەبێتەوە کە سیی ساڵە لە کوردستان بەرز کراوەتەوە ناچارم بە درێژی بچمە ناو ناخ و پەراوێزی بابەتەوە، لە بەر ئەوە سەیر نییە قسەم لە سەر نیوەی تەمەنی حاجی قادر هەزار و سەد لاپەڕە بگرێتەوە ئەگەرچی زۆربەی لایەن و ڕووداوی ژیانی

شاردراوەن، من کە بە دڵنیاییەوە و بە بەڵگەی بەهێزەوە دەڵێم حاجی قادر کەسێک بووە دەیانساڵ پێش سەردەمی خۆی کەوتۆتەوە هەندێ خەسڵەتی هەبوون لە هەڵکەوتوواندا نەبێ نییە، چاک دەزانم ئەم قسەیەم بە شێوەیەکی بەرەیی بەرانبەر گوتەیەکی حازربەدەستی مارکسی دەوەستێتەوە کە پێچەوانەی بۆچوونەکەی منە ئەوەش ئەوەیە لە بواری کەمکردنەوەی ڕۆڵی تاکدا دەیڵێنەوە و ئەوەش ئەوەیە ئەگەر زەید فلانە کار ئەنجام نەدا کەسێکی تر ئەنجامی دەدا. لە بەر ئەوە دەبوو لایەنی هەڵەی ئەو قسەیە ئاشکرا بکەم تا بۆچوونەکەم بەهای بمێنێ و حەقیقەت دەرکەوێ. لە هەندێ بابەتی بەشی سێیەمدا گوتم ئەو قسەیە دوو ڕاستی داپۆشیوە و هەر یەکێکیان لە خودی قسەکە گەورەترە: یەکەمیان ئەوەیە کە هەندێ لە تاکەکان کەس جێیان پڕ ناکاتەوە، وەک محەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای پێغەمبەر و ئەسکەندەری مەکدۆنی و جان دارک و غاندی و دەیان لێهاتووی تر... ڕێکەوتیکی سەیریشە حاجی قادر لەو بوارەدا کە ناوی تێدا دەرکردووە، یەکێ بێ لەوانەی کە جێی پڕ نابێتەوە و ئەو بەڵگەیەش بەسە کە یەکەم شیعری نەتەوەیی لە کەسێکی تر گوێمان لێی بووبێ بیست ساڵ زیاتر لە دوای وەفاتی حاجی بووە و سیی ساڵی کۆتاییەکانی تەمەنی خۆی کە گوێ و دڵی خەڵکی تێدا بە هەستی نەتەوەیی پڕ کردن، بەو شێوەیە نیو سەدە پێش یەکەم بێژەری شیعری نەتەوەیی کەوتۆتەوە. ڕاستی دووەم ئەوەیە ئەو گوتە ناوبراوە بێ ئەوەی مەبەستی بێ ڕۆڵی لێهاتوویی تاک دیاری دەکا و دەڵێ ئەگەر مەزنێک لەوانەی هەن نەبێ، مەزنێکی تر جێی پڕ دەکاتەوە و ڕۆڵی دەبینێ و بەوەش دان بەوەدا دەنێ تاکێکی تر پەیدا دەبێ نەک هەزاران یا سەدانی تر. بە دەگمەن نەبێ، کەسیش داوای لە خاوەن ڕایەکان نەکردووە کەمیی ژمارەی مەزنەکان لەوە گەورەترە بە یەک دوو کەس جێیان پڕ

بکرێتەوە و چاوەڕوانی ئەوەش لەوە ناکەین کە هاشا لە ڕۆڵی تاک دەکا، لە ناو دەیان ملیۆن بەشەردا بە یەک دوویەک جێی مەزنێک پڕ بکاتەوە چونکە لەوە لاوازترە ئەوەی پێ بکرێ. ئەو دەگمەنییە دەگمەنە خۆی بەڵگەی ڕۆڵی تاکی مەزنە ئەگەر لەگەڵ ئەوانەدا بەراوردیان بکەین کە جێگریان زۆرە و دەیان و سەدان هەزارن. یەک خوێندکار پەنجا هەزار کەس جێی دەگرنەوە، هەروەها وەرزێر و دوکاندار و ئەوانەی وەک ئەوانن و لە ژماردن نایەن بەڵام لینین وا نییە و ئەگەر وای دانێین کەسێ هەبوو ڕۆڵی ئەو ببینێ (ئەوەش بۆ دەمەتەقێ دەڵێین، دەنا زەحمەتە لەوە دڵنیابین بە نەبوونی لینین شۆڕشی شیوعی سەرکەوتوو دەبوو) لەوە زیاتر نەبووە یەک یا دوو کەس بن. تا کۆتاییە دیارەکان موناقەشەی بیرۆکەکەم کرد و گوتم نازانین چ پێویست دەکا لە سەر ئەوە سوور بین هاوکێشەی کۆمەڵایەتی داتاشین و بەوەی تاکی داهێنەر بدەینە پاڵی لە سەر کاغەز بە هاوکێشەی درۆ بەشی جەماوەر زیاد بکەین و دەزانین جەماوەر بەوە دەوڵەمەند نابێ و ناتوانێ هەست بە بەختەوەری بکا چونکە لە بنەڕەتدا نە تەماشای هاوکێشەکە دەکا نە تێیدەگا. سەرمان لەوەش سوڕماوە بۆچی حکوومەت داهێنان لە داهێنەر بسێنێتەوە و وەک ئەوەی ماڵی دزراوی پێ بێ و بیداتەوە خاوەنی کە گەلە، لە کاتێکدا بە خوێن و فرمێسک و شەونخوونی و ماندوێتی داهێنانی بۆ خزمەتی گەلەکەی کردووە. جگە لەوەش ئەگەر بە بەڵگەی شەرعی خاوەنداریێتی لە نێوان گەل و کوڕە لێهاتووەکانیدا سەپا، باوک (گەل) لوقمەی دەمی خۆی بە ئەولادە لێهاتووەکانی خۆی دەدا و ئێدی بۆ چ مەبەستێکی پیرۆز گومان و لایەنگری و خاوەنداریێتی ماڵی دزراو و شتی لەو بابەتانە کە جگە لە زەرەر هیچی تری نییە، بخرێتە پەیوەندی نێوان تاک و گەلەوە.. جگە لەوانەش نازانین چی لە کەسێکی لێهاتوو بکەین ئەگەر خراپەی کرد و

چۆن بە نیازی مەدحکردن خراپییەکەی بە سەر گەلدا بدەینەوە و ئایە دەکرێ داهێنان لە تاک وەربگرینەوە و واز لە خراپەکاری بێنین؟ دەکرێ نیوەی ڕدێنی مێژوو بتاشین و واز لە نیوەکەی تری بێنین؟ با لێرەدا ئەوەشی بۆ زیاد بکەم کە بوونی کەسێکی دی لە بری تاکێک کە ڕۆڵی لە مێژووودا هەیە کرۆکی ئەو کێشە فەلسەفییە چارەسەر ناکا کە خاوەنی ئەو بۆچوونە حیسابی بۆ دەکەن و ئەوە دەسەلمێنێ مێژوو لە شێوەی ڕەوتی خۆیدا بەرزەوت ناکرێ و لە سەر هیچ تاکێک، چەند مەزنیش بێ پەکی ناکەوێ چونکە پەیدابوونی کەسێک لە بری کەسێکی دی یەک ئەنجامگیری مێژوویی نابێ مەگەر لە مجێز و مەیل و ئارەزوو و باوەڕ و تواناداوەک یەک بن و لە کاروباری دنیادا وەک یەک ڕەفتار بکەن، واتە دووەمیان نوسخەی دووەمی ئەوی تر بێ وەک چۆن لە پیشەسازیدا کەرەسەی بەرهەمهێندراو لە یەک دەچن و یەک ئەرک ئەنجام دەدەن دەنا بۆچوون لە سەر بوونی کەسێکی تر لە جێی ئەو چ سوودێکی هەیە ئەگەر کارەکەی وەکوو کاری ئەوی دی نەبێ؟ ئەم تیۆرییە چی لە ڕەوتی مێژوو ڕوون دەکاتەوە ئەگەر سەپا نەمانی موعتەسەمی عەبباسی لە سەر دەسەڵات بەتاڵاییەکی وای جێنەهێشت پڕ نەکرێتەوە؟ ئەوە شتێکە دەیزانین و بایی ئەوە نییە لە سەری بوەستین چونکە گرنگ ئەوەیە خاڵوانی موعتەسەم تورک بوون و پشتی پێ بەستن و لە خۆی نێزیکی خستنەوە و پلەوپایەی پێ دان لە دوای ئەو دەسەڵاتی عەبباسییەکان کەوتە دەستیان و بەوەش ڕێڕەو و چارەنووس و ڕەوتی مێژوو گۆڕان و ئەگەر لە دایکێکی عارەب یا فارس بکەوتایەتەوە چاوەڕوانی ئەوە نەدەکرا کە بوو. گۆڕینی ڕەوتی مێژوو لە وڵاتێک لە وڵاتەکاندا و لە زۆر وڵاتدا لەوەیە لە سەر شتێ بەند بێ لە ڕووی مادد‌ییەوە زۆر لە خاڵوان و مامان کەمتر بێ و مردنی جەنگیزخان ئەوروپای لە هێرشی

لەشکرەکەی دەرباز کرد کە زۆری نەمابوو داگیری بکا ئەگەر بە کەیفی خۆی بە هۆی مردنی جەنگیزخانەوە پاشەکشەی نەکردبا. یا ئەگەر ڕێت پیشانی کافرەکانی قورەیش بدابا بچنە ئەو ئەشکەوتەی کە موحەممەد و ئەبوو بەکری لێ بوون، ڕەوتی گشتی مێژوو دەگۆڕا با هەزار فەلسەفەش دڵی خۆیان بەوە خۆش بکەن کە چارەنووس لە سەر پەیوەندی بارودۆخ بەندە.

ئەی خوێنەری عارەب دەبینی قسەکردن لە سەر بابەتێک کە پەیوەندی بە مەسەلەی ترەوە هەبێ قسەکەر بەرەو درێژیی و باسی تری وا دەبا ئەگەر نەبن تێگەیشتن و باوەڕهێنان نایەنە بەردەست و دەبنە چرۆی قەد دار و نهێنی بن گڵ و بە دەگمەن نەبێ دەستمان پێیان ناگا و ئەوەش بە شێوەی سەرەتایی و ڕووکەشی وا نە سوودی دەبێ نە دڵ ئارام دەکا. کاتێکیش دەکەوێتە تۆڕی شیکردنەوەی چینایەتی حازربەدەستەوە یا حازرکردنی واجب بێ ئاڵۆزتر دەبێ و دەبێتە بەربەست و لە هەر جێیەک فکر ویستی ڕەها بێ، دەبێ بە سەر ئەو کێشەیەشدا زاڵ بێ.

لە باسی نهێنی نەبوونی دەوڵەتی کوردیدا لە مێژوو، دەبوو بەرەوڕووی بۆچوونی حازربەدەستی مارکسی ببینەوە کە دەڵی ئەو کاتە حکوومەت دامەزرا کە چینەکان لە یەکتر جیابوونەوە ئەوەش بۆ بەدیهێنانی یەک تاکە مەبەست کە بەردەوامبوونی چەوساندنەوەی چینی ژێردەستە لە لایەن چینی باڵادەستەوە و بەوەش سستەم دانرا و بەندیخانە پەیدا بوو و سوپا دامەزرا و شتی تری لەو بابەتانە. مادامیش نیەتی چەوساندنەوە تاکە هۆکار بووە بۆ پێکهێنانی دەوڵەت، دەبێ لەگەڵ نەمانی چەوساندنەوەدا هیچ ڕێکخراوێکی ڕوو لە دەسەڵات لە

سستەمی کۆمۆنیزمدا نەمێنێ.. گوتم ئەمە بۆچوونێکی ڕاست نییە و بەرژەوەندییەکانی مرۆڤ لە سەردەمی شارستانەتیدا (دوای ژیانی ئەشکەوت..) پێویستی بە سستەم هەیە تا بەڕێوەی ببا و بەردەوامی پێ بدا و بەرگری لێ بکا، جا چەوساندنەوە هەبێ یا نەبێ پێکهێنانی حکوومەت پەیوەندداره بە پێشکەوتنەوە و بۆ بەرژەوەندی پێویستە. مادامەکی پێشەکی ئەم ڕامانەی مارکسیزم دروست نەبێ ئەنجامیش بەو شێوەیە نابێ کە چاوەڕوان دەکرێ. ئاشکرایە سستەمی حوکم لە کۆمەڵگەی سۆسیالیزمی مارکسیدا هەتا دێ قایمتر و بەربەرینتر دەبێ و دەگاتە ئەوەی ژیانی خەڵکی لەخۆ بگرێ تا وای لێ دێ گەل بزر دەبێ و هەموو شتێ دەبێ بە دەسەڵات و حکوومەت.. لێرەدا ئەوەش دەڵێم ئەو جۆرە بۆچوونە لە بارەی چەوساندنەوەی چینایەتییەوە بەوەمان دەگەیەنێ کە هەموو دیاردەیەکی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی بۆ هۆکارێکی چەوساندنەوە بگێڕینەوە وەک ئەوەی بڵێین بەشەر بۆ ئەوە نووسینی داهێنا تا ئەو قامچییانە بژمێرێ کە لە پشتی وەرزێر دەدرێن و شیعری بۆ ئەوە داهێناوە گریان و لاواندنەوەی ژنی غەدرلێکراو داڕێژێ و بەرگی بۆ ئەوە داهێنا تا ژیانی کۆیلە بهێڵێتەوە و پتری بچەوسێنێتەوە و ڕەنگە ئاگریشی بۆ ئەوە ویستبێ جەستەی ئەوانەی پێ داغ بکا کە ئەشکەنجەیان دەدا و زانیشمان ئایین لە لای مارکسییەکان ئەفیونی گەلانە بەڵام نەمانزانی ئەفیۆنی ئیسلام چۆن خواردنەوەی ئەو شەراب قەدەغە دەکا کە عەقڵ و پارە بە هەدەر دەدا؟ لە لایەنە کورتهێنەکانی ئەم تیۆرییە لە مەودای پەیدابوونی دەسەڵاتدا سەرنجی ئەوەم دا زۆر کۆمەڵگە چینیان تێدا پەیدا بوو بەڵام حکوومەت نا. کوردستانیش یەکێلە لەو کەمانەی ئەو تیۆرییە کە بەشی زۆر و درێژی مێژووی پان و قووڵی خاکەکەی دەگرێتەوە. بە نەبوونی تێۆرییەک کە بەکەڵکی ئەو ڕاستییە مێژووییە کوشندەیە

نەکا و لە ژیانی گەلی کورد و بێدەنگی هەموو سەرچاوەیەک کە پشتی پێ دەبەسترێ و پێی نابەسترێ، من لە کونجی ساکاری خۆمەوە گەیشتمە لێکدانەوەیەک باوەڕم پێی هەیە و ڕەنگە ڕاست بێ یا هەندێ لە ڕاستییەکانی لەخۆ گرتبێ و پێویستی بە تەواوکردن بێ. سەرنجم دا دیاردەی نەبوونی دەوڵەتی کورد لە ماوەی هەزاران ساڵدا هاوشانی دیاردەیەکی ترە ئەوەش بوونی چەقی سێ شارستانەتیە بە دەوری کوردستانەوە: ئیمپراتۆریەتی ئێران لای ڕۆژهەڵاتیەوە، دەوڵەتی ئاشوور و بابل لە باشوورەوە و ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی و هەرچی لە ژێر دەسەڵاتیدا بوون لە لای ڕۆژاواوە و ئەوەش بووە هۆی دیاردەیەکی بەردەوامی تر و ناوم لێ نا (لەبەرچوونی ئابووری) و چۆن ڕەوتی ئاو لە شاخەکانی کوردستانەوە دەڕژایە خاکی ئەو دەوڵەتانەوە، کەرەسەی خاویشی بە بەردەوامی تێ ڕژاوە و نەبۆتە تەوەری بازرگانی ناوخۆ و مەکۆی بزووتنەوەی ئابووری تا بەشەکانی کوردستان بە یەکەوە گرێ بدا و توانای چالاکی زیاد بکا و سەرچاوەی ژیان هەمەلایەن و هەمەجۆر بکا و پێداویستییان دابین بکا. هەموو ئەوانە بە هۆی لەبەرڕۆیشتنی ئابووری کوردستانەوە بووە و دەیان سەدەیە بزرن و بۆ گەل وەک خوێنن چونکە هێز و گەشەکردنی پێ دەبەخشن. یەکپارچەیی خاک و زمان بە بێ هێزی پێویست بۆ پێکهێنانی دەوڵەت خۆبەخۆ بەش ناکەن تا کورد لە کیانێکی بەهێزدا کۆ بکەنەوە و قووتی ڕۆژانە و وەرزانە و ساڵانە قەت ئەو پێداویستییانە پڕ ناکەنەوە کە بۆ دروستبوونی دەوڵەت پێویستن و لە ژماردن نایەن. ئەوەی ڕاستی ئەم بۆچوونە دەسەلمێنێ ئەوەیە هەر لایەک هاتبێتە کوردستانەوە بەر هەمان کێشانە و پێوانەی لەبەرچوونی ئابووری کەوتووە و یا تیایدا نەماوەتەوە یا لە ناو دانیشتوانیدا، بە بێ دەوڵەت و دەسەڵات خۆی داوەتە دەست تواندنەوەوە. لە کاتێکدا ئەوەی خاکی بابلی داگیر کردبێ

دەسەڵاتی ئەوانەی پێش خۆی بۆ ماوەتەوە و وەک ئەوان دەسەڵاتی بووە.. هەر وەها بە گشتی، شتی تری لەو بابەتانە.. کە نۆرەی قسە هاتە سەر کۆیە کە وڵات و پەروەردگا و جێی شانازی حاجی قادرە لە زۆربەی شیعرەکانیدا، ئەوەی دەبوو یەکەم شت بەرپەرچی بدەمەوە بۆچوونێک بوو لە ڕۆژناماندا بڵاو کرایەوە و لای خوێنەران جێی بایەخ بوو و کۆیەی بە دواکەوتووترین ناوچەی کوردستان لە قەڵەم دابوو و منیش پێچەوانەی ئەوەم لە هەموو شتێکی پەیوەندیداردا دەربڕی بە تایبەتی لە گرنگترین لایەنی کۆمەڵایەتییەوە کە ڕۆشنبیرییە و وای بۆچووم کە نووسەری بابەتەکە زۆریی ژمارەی مزگەوتی کردۆتە بەڵگەی چڕیی دواکەوتوویی تیایدا گوایە خوێندنی مزگەوت خوێندنی نەزانییە و بێکەڵکی ئەو بۆچوونەم خستە ڕوو و گوتم خوێندنی دینیی و مزگەوت سەدان ساڵە زانیاری مرۆیی دەخوێنن لە فەلسەفە و لۆژیک و حیکمە و بیرکاری و زانستەکانی تر و زانای دینیی کورد لەو سەردەمانەدا نێزیکترین نموونە بوونە لە ڕۆشنبیرییەوە، بە پێچەوانەی ئەم ڕۆژگارەمانەوە.. دووریی نێوان ڕۆشنبیری ئەم سەردەمە و ڕۆشنبیریی جیهانیی نموونەیی، چەندین جار لەوە زیاترە کە زانای کوردی ئەو سەردەمەی لە زانایانی خەڵکی دی جیا دەکردەوە. نموونەی ئەوەشم هێناوەتەوە کە (ئیبراهیم حەیدەری)ی هەولێر کە زانایەکی کورد بووە و لە دوادوایی سەردەمی عوسمانیدا بووە (شیخ الاسلام) و لە بەرزترین پلەی جیهانی ئیسلامی بەرزتر بووە و لە بواری جیهانیدا دەگاتە ئەوانەی خەڵاتی نۆبڵیان بە دەست هێناوە و نیو سەدە تێپەڕی و یەک کورد ئەو خەڵاتەی پێ نەدراوە، ئێدی ئێستامان لە کوێ و ئەوسامان لە کوێ! قسەش لێرەدا ڕێژەیی و بەراوردکارییە لە نێوان خۆمان و خەڵکی سەردەمە جیاوازەکاندا. ئەوەشم گوتووە کە گەورەترین مامۆستای کورد لە زانکۆکاندا لای (ئیبن ئادەم)ی زانا

نابێتە خوێندکارێکی پێشکەوتوو کە بەر لە سەدوسیی ساڵ مردووە و (فصیح الحیدري..) لە بارەیەوە دەڵێ ئەگەر کتێبی زانست لە دنیادا نەمێنێ ئیبن ئادەم هەر لە بەر دەیانڵێتەوە. ئەوجا ڕۆڵی کۆیەم لە بواری شارستانەتی لە حکوومەتی کورددا دیاری کرد کە تاکە چەقی شارستانەتی بە قەوارەی شارێک بێ و کەوتبێتە نێوان کەرکووک - هەولێری ڕۆژاوا و سنە و سابلاغی لای ڕۆژهەلاتەوە ئەوەش لەو سەدانەوە کە شارەزووریان تێدا وێران کرا تا دەگاتە سەردەمی دروستبوونی سلێمانی بەر لە نێزیکەی دووسەد ساڵ. شوێنەواری ئەو کۆنییە لە ڕۆڵی شارستانەتیدا ئەوەیە کە ناوچەی کۆیە عەشائیری تێدا نییە و وەرزێرەکانی بە زەوییەوە پەیوەستن نەک سەرۆک و وەختە بڵێم ئاغاشیان تێدا نییە و ئاغا بە هۆی پێشکەوتنی وەرزێری کۆیەوە کە پلەیەک بە سەر عەشیرەتیدا پێشکەوتووە، بۆتە بوونەوەرێکی وا کە خۆش ناویسترێ چونکە لە ژیانیاندا ئەرکی کۆمەلایەتی بەسوود بەجێ ناگەیەنێ و ئەوەش پێچەوانەی پەیوەندییە عەشرەتییەکان و سەرۆکی عەشرەتە پارێزگارەکانە.. ئەو پێشکەوتنەش شتێ نییە جگە لەکاریگەری شارستانەتی کۆیە بە سەر ژیانی گوندەکانەوە لە ماوەیەکدا کە سەرەتای دیار نییە و ئەوەش بووە هۆی مڵکدارێتی بچووک لە گوندەکانی ناوچەکەدا تا دەگاتە ئەوەی نێزیکەی حەفتا لە سەدی زەوییەکانی هی وەرزێرەکانی بێ و لەو توێژینەوانەی پەیوەندییان بە حاجی قادرەوە هەیە دەرکەوتووە خێزانی حاجی خۆشی خێزانێکی وەرزێر بووە و زەوی خۆیان هەبووە با لە ڕووبەرێکی زۆریشدا نەبووبێ بەلام وای لێ کردووە بەوە سەربەرز بێ تارمایی مڵکداری گەورەی دەسەلاتدار لە گوندەکەیدا بە یەکێ لەم دوو شێوازە نەبووە کە یا دەبوو تۆوی بێدەنگی لە دەماریدا بڕوێ کە لە منداڵییەوە چاوی دەکاتەوە زۆردارێک سووکایەتی بە کەسوکاری دەکا و

فەرمانیان بە سەردا دەردەکا یا بە پێی تاقیکردنەوەی پەیوەندی نێوان ئاغا و مسکێن دڵی پڕ دەکا لە ڕق لە هەموو ملْکدارێک. ئەوەش دەزانین کە هیچ کام لەو دوو وێنەیە لە هیچ ڕەفتارێکی حاجیدا بە درێژایی تەمەنی ڕەنگی نەداوەتەوە. ئەو بارودۆخە ماددی و مەعنەوییە بە دەگمەن نەبێ پێکەوە نابن تا کەشوهەوای کۆمەڵایەتی وا برەخسێنێ کەسایەتییەکی وەک حاجی پێکبهێنێ و پەرە بسێنێ و پێم وا نییە لە درێژایی و پانایی کوردستاندا پارچە زەوییەکی تر هەبێ بەرگەی خواستەکانی دەرونی بەرز و بەهێزی حاجی بگرێ لە کاتێکدا لەوپەڕی هەژاری و ئاوارەیی و گۆشەگیریدا بوو و لە کەرتوپەرتی هەموو دنیادا جگە لە سێ پارچە زەوی لە گوندەکەیدا کە هەندێ شووتی و کاڵەگی پێ دەبەخشی و لە وەرزی خۆیدا بە سەر هاوڕێکانیدا دابەشی دەکرد هیچی تری نەبوو و بە کەمێ خۆشەویستیش مانگێ یا دوو مانگ پتر زگ تێر نابێ و هەرچییەکی مرۆ لە شاردا بۆ گوزەران پێی ویستبێ ئەو بە دەستی نەهێنا کە ئاشکرایە مەسرەفی لە دروستکردنی خانوو و پێکەوەنانی خێزان و شتی لەو بابەتانە کەمترە. حاجی لە کۆیە، لە زۆر لایەن و بواردا، بە پێی ئاگاداریمان وێنەیەکی لە ئاسایی بەدەر بوو لە کۆیە و لە ڕووی هێزی ماددییەوە گەیشتبووە خواری خوارەوە و لە شانازی بەخۆبوونەوە گەیشتبووە لووتکە و دەست بە تیغی شیعر و بە تاقی تەنها بەرەو ڕووی گەورەترین و فێڵبازترین و بەهێزترینی ئەو کەسانە ببۆوە کە ئایینیان بۆ مەبەستی دنیا بەکار دەهێنا و کۆیە لە مێژووی خۆیدا چاوی پێ کەوتبوو کە شێخ نەبی ماویلی بوو و لە بەربەرەکانیکردن و وێرانکردنی کەسایەتی ئەم شەعبەدەبازەدا گەیشتە ئەوەی داوا لە موریدەکانی خۆی بکا حاجی بکوژن و حاجیش کە نەفسێکی بەرزی هەبوو هانای بۆ سەرکردەیەکی بەهێزی ئایینی تری نەبرد کە (شێخ غەفوور تاڵەبانی) بوو و موریدی هەبوو و جیاوازی

لەگەڵ ئەو شەعبەدەبازەدا هەبوو، بەڵکو لە یەکەم دەرفەتدا دوو بەرابەر تۆڵەی لێ کردەوە و قەشمەری پێ کرد. حاجی هەر بە سروشتی خۆی نەفسی بەرز و باوەڕی بە خۆی هەبوو و بە توندیی لایەنگری هەق بوو و لە ژیاندا سەرڕاست بوو و جلی شۆڕەسوارانەی ڕەوشتبەرزیی وای پۆشیبوو و پێمان وا نییە کەسێکی لەو شایستەتر پۆشیبێتی و بە زمانێک چەکدار بوو نەدەچووە کێلانەوە و لە مەیداندا بە کوشندەترین چەک پڕچەک بوو و هونەری دەنواند. ئەو حاجییە کەرەسەی ناسەقامگیری شڵەژاوی بابەتە کۆمەڵایەتییەکان بوو و جگە لە کۆیە هیچ کوێی تر کە لە پلەوپایەی بواری پیت و کراوەیی و هەمەبۆچوون و هەمەقوتابخانەدا کەمتر بووبێ پەنای نەداوە و جێی نەکردۆتەوە. هەرگیز نەمانبیستووە کەسێکی وەک ئەو لە تەختانی و بەردەڵانی کوردستانی ئەو دەمە و پێش ئەو دەمە هەبووبێ و ئەوەی لە نەریتە کۆمەڵایەتییەکاندا چاوەڕوان دەکرێ ئەوەیە هەر کەسێ بەرەو ڕووی شتێکی لە خۆی گەورەتر و مەترسیدارتر ببێتەوە دەبێتە بابەتی نوکتە و پێکەنین و ئەو گەورەپیاوانەی مێژوو کە بە دەستی بەتاڵەوە بەرەو ئامانجی گەورە چوون لای خەڵک سووک بوون و هەموو دەرگایەکیان بە ڕوودا داخراوە و لە ناو خەڵکدا ئێسکیان قورس بووە، ئەوەش بە پێچەوانەی حاجییەوە کە چ هاوسەنگییەک لە نێوان تای هەڵوێستی بوێرانە و نەفسی بەرزی، و تای بێ کەرەسەیی هێزێکی وادا نییە کە جەللادی پێ پشتئەستوورە، ئەوە نەبێ ڕەوشتی بەرزی و شاعیریێتی ناسکی پلەوپایەیان لە ڕیزی پێشەوەی کۆمەڵگەی کۆیە بۆ داناوە و بە ڕێزەوە حیسابی بۆ کراوە و لە کۆڕ و دیوەخاندا جێی هەبووە و لە مێژوودا بە بەرزی، هەتا ئەمڕۆ ناوی هاتووە. ئەم بارودۆخانە و شتی تریش کە لە کتێبەکەمدا باسیان کراوە ئیمکانی بوونی حاجی لە کۆیە دەردەخەن و ڕووەک لە سەر بەردی ڕەق گەشە

ناکا. ئەو شتانەش کە نیشانەی شارستانەتی و پێشکەوتن و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی کۆیەن ئەوەیە کە تاکە ناوچەی کوردستانی عیراقە توانیبێتی ململانێی سلێمانی لەوەدا بکا کوردی لە شیعردا بەکار بێنێ ئەگەرچی وەک سلێمانی و ڕەواندز چەقی دەسەڵاتی بابان و سۆرانیش نەبوو. یەکێ لەو ڕێکەوتە خۆشانەی کە لە پەناوپەسێوی توێژینەوەکانمدا بۆ یەکەم جار پەیم پێ برد، ئەو بارودۆخە مێژووییە بوو کە زمانی کوردی خستە مەیدانی شیعرەوە، ئەوەش کاتێ لە گەرمەی بیرکردنەوەدا بووم لەو بابەتانەی کە لە ڕووە جیاوازەکانەوە پەیوەندییان بە باسەکەوە هەبوو، کتوپڕ چاوم بە دەستنووسێکی کۆن کەوت و بەر لەوەی سەرنجم بۆ ئەوە بچێ کارەکانمی پێ ئاسان بکەم کە زۆربەی هەرە زۆریان بە هۆی دەگمەنیی هەواڵی دەماودەم و نووسراوەوە دەکەونە بەر هێزی هزرمەوە، خۆبەخۆ خزایە بەر مەودای سەرنجم. ڕێکەوتێکی چاک بوو کە یەکێ لەو کتێبە دەستنووسانەی کە لە کتێبخانەی (جەلیزادە)دا ماونەتەوە نوسخەیەکی (صحیح البخاري) بوو کە لە لایەن عەبوڕەحمان پاشای بابانەوە پێشکەشی (عەبدوڕەحمان جەلی)ی باپیرەگەورەم کرابوو و لە داڕشتنی وەقفەکەیدا وا هاتووە کە وەقفی فڵانە کەسە، ئەوجا زاناتر و زاناتری منداڵەکانی ئەگەرنا پێگەیشتووتر و پێگەیشتووتری کوڕەکانی (...ئەوجا ئەو زانایانەی کە لە ناوچەی کوردستانی نێوان موسڵ و بەغدا و سنەدان). وشەی کوردستان کە لە داڕشتنی وەقفێکی شەرعیدا هاتووە کە لە دوای قورئان، لای سوننەکان پیرۆزترین کتێبی دینییە و لە سەردەمێکدا بووە کە پێش ساڵی 1211ی کۆچی کەوتۆتەوە. نیگاری شۆڕشی فەرەنسیم بە خەیاڵدا هات کە سەرچاوەی بزووتنەوەی نەتەوایەتی مێژووی دوای خۆیەتی و کە کۆچیم کردە زاینی دەبینم حەوت ساڵ دوای شۆڕشی فەرەنسی بووە و ئەوەش بۆ ئەوەی

کاریگەری بە سەر میرێکی کوردەوە هەبێ کە پەیوەندی بە ژیانی سیاسی نێودەوڵەتییەوە هەیە بەسە بە تایبەتی چاوی تەما و هیوای لە دەسەڵاتی سەپاو و ناوەڕۆکی ئارام بڕیبێ و مان و نەمانی لە سەر بێگانە نەوەستابن و خۆی و گەلەکەی لە کارەساتی هێرش و داگیرکاری بپارێزێ کە لە ڕۆژگاری ئەودا بەردەوام دووبارە دەبوونەوە. توانا و خەسڵەتە تایبەتییەکانی عەبدوڕەحمان پاشا وایان کردبوو تەنها خۆی لە ناو میرە کوردەکاندا لە دەرکەوتە نوێیە نائارامە نێودەوڵەتییەکان تێبگا و بە گوێرەیان هەڵوێستی هەبێ. ئەوجا ئەو وێنانەم بە خەیاڵدا هاتن کە لە ڕووی نەتەوایەتیشەوە لە سەری باس دەکرێن و بەرزترینیان ئەوەیە کە داوایان لێ کردووە وەک وەزیرێک ویلایەتی بەغدا وەرگرێ، گوتوویەتی قومە ئاوێکی ساردی کوردستانم لەوە پێ خۆشترە. ئەگەر ئەمە ڕوون ببێتەوە، ئەوەش ڕوون دەبێتەوە بۆچی شاعیرەکانی بابان لە کۆتاییەکانی سەردەمی ئەودا بە گورجوگۆڵی، بە زمانی نەتەوەیی کەوتنە نووسین. ڕەنگە ئەوەش ڕاست بێ بە دەرکەوتنی پێداویستی شیعری کوردی، دەرنەکەوتنی جێی سەرسوڕمان بێ و ئەوجا بە دووی هۆکارەکانی دواکەوتنی دەرکەوتنیدا بگەڕێین. دیارترین لایەنی ئەم دیاردە ئەدەبییەی کە لە بواری ئەو پێشکەوتنە ئەدەبییە نەتەوایەتییە کەوتۆتەوە ئەوەیە کە کۆیەی لە حاجیدا بەرجەستە، یەکەم ناوچەی هەموو کوردستانی عیراق بوو کە بە دوای شاعیرەکانی سلێمانیدا هەنگاوی نا. جگە لەوەش، کۆیە وەک حاجی دەیسەلمێنێ بووە مامانی یەکەم کەس کە لە بواری نەتەوایەتیدا هاتبێتە دەست، ئەوەش نەک هەر لە شیعردا بەڵکو لە زماندا بە گشتی. لەمەوە دەردەکەوێ کە کۆیە بە خوێندنگا دینیە زۆرەکانیەوە، ئەو کوردە مارکسییانە دەستخەڕۆ دەکا کە چاوەڕوانی نەخوێندەواری و وەپاشکەوتن لەو خوێندنگایانە دەکەن. کاتێ لە

کتێبێکی دینی ئەوپەڕی ڕەسەندا بەڵگەی چەکەرەکردنی هەستی نەتەوایەتی دەردەکەوێ و چ باسی پرۆلیتاریا یا ماتریالیزم نەبێ، دەسخەڕۆییان دەبێتە دوو هێندەی خۆی، چونکە نەتەوایەتی لەگەڵ ناوی میردا دێ نەک هەژارێکی دینپەروەر یا پێچەوانەکەی. لەبەر ئەوە نووسەرەکانیان دەبینی لەو مەسەلانە بێدەنگن و وەک ئەوەیە مەسەلەیەک نەبێ و لە باسی دۆزینەوەکەشدا وەک ئەوەیە دۆزینەوە نەبێ لە کاتێکدا کە درۆیەکی ماددی بۆ هەر باسێکی ئەو بابەتە دەکرێ، دەیکەنە هەرا.

لە هەموو هەنگاوێکدا کە دەمنا، دوو هەوڵی زیادەم لە بەردەمدا هەبوون، ئەوەی پێویستە هەر گواستنەوەی هەنگاو نییە کە خەلقەندەکانی خوا لە سەر زەوی و لە زمان و ڕۆشنبیری تردا ئەنجامی دەدەن بەڵکو شانبەشانی ئەو هەوڵەی کە لە ڕەوتی ئاساییدا دراوە، یەکێکی تری لە خۆی ئەستەمتر بە لایەوە دەرکەوتووە، ئەوەش ئەوەیە کە دەبێ بەرپەرچی هەبوونی ڕێڕەوێکی تری پێ بدەمەوە و هەنگاونان تیایدا ڕاستییە. ئەگەر کتێبە کوردییەکانم بخوێنیتەوە بۆت دەردەکەوێ ئەوەی من بە دەستیەوە تووش هاتووم، نووسەری تری زمانەکانی تر تووشی نابن ئەوەش بەربەرەکانێی تارمایی نارەزاییە بەرانبەر بابەتگەلێک کە لە ئاستی بەڵگەنەویستەکاندان. من ناچار مام بەرگری لەوە بکەم کە حاجی پارێزگاری لە دینەکەی خۆی و پاکیی ئەو دینەی کردووە و ڕێزی گرتووە، جگە لە لایەنەکانی تری ڕەوشت. ئەوەش لە بەر ئەوەی مەیلی ئاشکرا هەبووە بە لای ئەوەیدا بەرێ کە کەموکوڕی گەورە و ئاشکرای ئەدیبی بێ ناوی سەر بە چەپ داپۆشێ کە نەیانتوانیوە خۆیان بەرانبەر نەفس و ئارەزوو چەپارە بدەن. لەبەر ئەوەی قەڵەمیش هەن لە سەر ئەو بابەتانە بنووسن و خاوەنیان بە

شەڕەجنێو و توندوتیژی و لێدان بە دەست و بەلاق ناویان دەرچووە، پێیان خۆش نییە حاجی لە سەر ڕۆژوو و نوێژ بەردەوام بووبێ و خۆی لە شوێنی ناشایستە پاراستبێ و بەوەش پۆلیس بە مەستیی شەو لە دووی شەو نەیگرتبێ و وەک هەندێ کەس تفی سووکایەتی بە ڕوخساریدا دانەچۆڕابێ. گوتووشمە ئەدەبێک تفی لێ نەکرابێ بە ڕاستی حەقتر و شەرەفمەندترە. ڕەنگە پێت سەیر بێ کەسانێک لە مەیدانی (ڕۆشنبیری!) کوردیدا هەبن، ئەدەبیان کردبێتە کەرەسەی شەڕەجنێو و هەستی ئازاری سووکایەتی پێکردنیان لە دەست دابێ و ئەو ڕۆژەشیان لێ دەبێتە جەژنی جەژنان کە ململانێی کەسێکی پاکی تێدا بکەن تا هەندێ لە پۆخڵەواتی خۆیانی لێ بسوون و پێیان ناخۆشە نەتوانن پاکژییەک مابێ و لەکەداری نەکەن. ئاگادار نیم بوارێکی ئەدەبی لە جیهاندا هەبێ تیایدا بتوانن وەک هەندێ لەو سوارچاکە جنێوفرۆشانەی ڕۆشنبیری کوردی تەراتێن بکەن و ناویان بە شەڕەجنێو و شەڕەمشت و لەقە دەرچووبێ، تا ئەوەی زۆر لە کۆبوونەوە (ڕەسمی!)یەکانیان بە (میسک)ی گلۆربوونەوەی هەندێکیان کۆتایی دێ... زۆربەی ئەوانە (یەدەگ!)ی (شەڕ!)ی بیری مارکسی کوردن کە بە سەر هەندێ لایەنی وادا سەپاون دەسبەرداری چاکەکاری و لۆژیکی خاوێن و زۆر لە ناحەزەکانیان کەڵەگەتترن.

شتێکی (خۆش!) لەم بارەیەوە ئەوەیە کە نووسینی ناوبراو لە دێڕە بەرایییەکانیدا وەپاڵ منی داوە گوایە جنێوم بە هەندێ کەسایەتی شۆڕشگێڕ داوە و لەوەدا لەگەڵ خۆیدا بە ویژدان بووە چونکە هەوڵێکی تری هەڵبەستنێکی نوێی پێ پاشەکەوت کردووە و دوای ئەوەی هیچ بەهایەک و هەق و ڕاستگۆییەکی لە نووسینەکانی مندا نەهێشتۆتەوە پەلاماری نەدا، خۆی وا پیشان دەدا کە بەرگری لە (بەها!)کان دەکا و

بەوەش خۆی خەڵات کردووە و داهێنایێکی کردووە کە لە ویژدانی نەخۆشی خۆیدا نەبێ بۆ ڕەواکردنی هەڵبەستن و پیلانگێڕی لە قسەکانمدا، لەدایک نەبووە.

بەڵام گوایە لە یەکێ لە کتێبەکانمدا جنێوم دابێ ئەوپەڕی ڕۆچوونە بە درۆدا چونکە لە هەموو نووسینەکانمدا خۆم لە ناوهێنان بواردووە، شۆڕشگێڕ و ناشۆڕشگێڕ، مەگەر لە دیوانی حاجیدا باسیان هاتبێ و ئەوەش نە بەشی ئەوە دەکا ببێتە جنێو بە شۆڕشگێڕ، نە بۆ ئەوە دەبێ ببێتە پێداهەڵدانیان. ئەگەر مەحاڵیشی ویست مەدح و زەمم بە سەردا بدا، با یەخەی حاجی قادر بگرێ نەک من. لە ڕاستیدا حاجی هێرشی کردۆتە سەر شەعبەدەبازەکان بە گشتی و ناوی تاکوتەرای هێناون و ئەوجا بە ڕەخنەی توند و قسەی بەئازار هاتۆتە سەر ئەوانەی لە ئەرکی نەتەوایەتیدا کەمتەرخەمی دەکەن و ئەوەش چاکەیەکە کەس لەو مەیدانەدا پێشی نەکەوتۆتەوە. دڵنیام ئەگەر بە سروشتی ئازا و قسەلەڕوویی زیادەڕۆیی لە ڕووی نەتەوایەتی خۆیەوە ئەمڕۆ لە ناوماندا بمابا، گلەیی زۆری لە زۆر کەس دەکرد کە لە بواری نانەتەوەییانەدا ناوبانگیان دەرکردووە و لە دەرەوەی چوارچێوەی نەتەوایەتی بەو ناوبانگە ڕازین و تواناکانی کوردیان لە جێیەکدا خستۆتە کار کە لە لێکدانەوەی خەیاڵی تۆباویدا نەبێ لە بەرژەوەندی کورددا نییە و ئەوەش زۆر لەوە کەمترە نەوەی ئەم سەردەمە پێی بەختەوەر بێ و بکەوێتە نیعمەتەوە.

لە بواری خۆلادان لە ناوهێنان گەیشتمە ئەو ڕادەیەی کە هەندێ لە خوێنەران گلەییم لێ بکەن و بیانووشیان ئەوەیە کە ڕەنگە باسەکەیان لێ تێک بچێ و مەبەستیان لێ ببێتە شتێکی تر، بیانووی منیش دوانن،

یەکەمیان ئەوەیە لەخۆڕا شتێ نادەمە پاڵ کەس و ئەگەر کەسێکی دیاریکراو لای خوێنەر بزر بێ، خۆ لە ڕاستگۆیی قسەکانمدا بە بێ گومان لە خاوێنێ دەمێنێتەوە کە دوور نییە بە دڵیدا بێ.. دووەمیان ئەوەیە ڕووبەری (ڕۆشنبیری!) کوردی پڕاوپڕە لەو قەڵەمانەی کە بۆ سووکایەتیکردن و جنێودانی وا هەڵکێشراون مرۆڤی پاک شەرم دەیگرێ و چەند پێی بکرێ خۆی لە پروشکیان دوور دەگرێ و خۆلادان لە هەندێ ناو دەچێتە خانەی ڕێگرتن لەو زمانانە و بیانووی جنێودانیان ناهێڵێ و خۆ ئەگەر بەوەشەوە جنێوی دا ڕووت دەبێتەوە و دەچێتە خانەی بێ ئابڕوویيەوە و پلە بە پلە سەرەوخوار دەبێتەوە ئەوەش ئەوپەڕی هەوڵی قەڵەمی زندووە تا خۆی پێ بپارێزێ و لە بێئەدەبی دوور کەوێتەوە.

هەڵوێستم بەرانبەر جنێو و وشەی سووک بە کەسێکی دیاریکراو دیاردەیەکی وەرزی نییە لە ژیانمدا هەتا جارێ دەرکەوێ و جارێ بزر بێ بەڵکو هەڵوێستێکی گردەبڕە و لێبۆتەوە و پێویستی بە پێداچوونەوە نییە و بە ئاشکرا ڕەت کراوەتەوە و ژیانی جنێودەر ژیانی خەلقەندەیەکە مروەتی کەمە و ڕێزی خۆی ناگرێ. هەر لە سەرەتای بەرگی یەکەمی کتێبی ژیانی حاجی قادردا ڕای خۆم بەرانبەر جنێو و جنێوفرۆش بە ڕوونی و بە جۆرێ دەربڕیوە مەودای ئەوەی نەهێشتۆتەوە خوێنەر چاوی تری پێدا بخشێنێتەوە. وەرگێڕانی ئەوەی لەو بارەیەوە لە لاپەڕە 20ی بەشی یەکەمی حاجی قادری کۆیی)دا هاتووە، بۆ عارەبیخوێن دەخەمە ڕوو:

"هەندێ جار نووسەرم دیوە پلەی سووربوونی لە سەر هەڵە تێپەڕاندووە تا لە لوتکەی هەرە بەرزی ڕاستپۆشی سەرکەوتووە و

بەودیودا شۆڕ بۆتەوە بەرەو زەلکاوی جنێوفرۆشی. وەک پەندێکی برایانە و حەقیقەتێکی بێ پەڵە بە گەنجی کورد دەڵێم جنێودان نیشانەی سووکایەتی ئەو کەسەیە کە جنێو دەدا چونکە دیارە پەروای نییە لەوە کە لە مقابەلەدا جنێوی پێ بدرێتەوە. متەنەبی چەند ڕاستی گوتوە کە دەڵێ:

من یهن یسهل الهوان علیه
ما لجرح بمیت ایلام

ئەوەی سووک بوو سووکایەتی لێ خۆش دێ، برین ئازار بە مردوو ناگەیەنێ.

بێگومان مرۆڤی ڕەوشتپاک بەر لەوەی ترس مەنعی بکا لە جنێو، سروشتی خاوێنی خۆی قێزی هەڵدەستێ لە جنێودان ئیتر لە بەر بەرزی سروشت زمانی خۆی دەپارێزێ و ڕێزی خەلق ڕادەگرێ. سەرنج بدە جنێوفرۆش دەبینی لە بەر پەستی نەفسی یەخەگیری کەسی وەها یاخود لایەنی وەها دەبێ کە بە بێدەسەلاتیان دەزانێ و لێیان ناترسێ. کە بزانێ جنێودانەکە دینارێکی لە کیس دەدا وە یا دوو شەوان دەیخاتە بەندیخانەوە دەمی خۆی دەدروێ و دەبێتە نموونەی شەرم و شکۆ.

وا دەبێ زارشڕی بۆ مەبەستی شەخسی بەکار دێ. کابرای زارشڕ دەیەوێ بە جنێوفرۆشی مەیدان بۆ خۆی چۆڵ کا چونکە دەزانێ زۆر کەس خۆ دەپارێزێ لەوە کە قسەی سووکی پێ بگوترێ. مرۆڤی شەرم بەخۆ بە وشەیێکی بێحورمەت نیوە مردوو دەبێ و زات ناکا نێزیک بێتەوە لە جێگە و ڕێگەیەکی ترسی بێحورمەتی تێدا بێ.

شەخسی جنێودەر ڕاستەوخۆ وەک کەسێکە (بۆ خۆم یەکێکم دیوە لەو تەرزە) تف بکاتە ناو قاپی چێشت تا هاوبەشی نەبێ لە خواردندا. ئەو شەخسە خۆی لە خواردنیش ناکا ئەگەر یەکێکی دی وەک ئەو چێشتەکەی پیس کرد. بە نیسبەت گەلی کوردەوە ئەو ڕەوشتەی ڕاسپۆشی وە یا مەیدان لە سەر خەلق تەنگکردنەوە و دەرپەڕاندنیان لە کۆڕی زانست و ڕۆشنبیری زیانێکی زلتری هەیە لە چاو گەلێکی دیکەی چەسپاوی خاوەن کیان و سامان چونکە وەک (بدیهیە) وایە بە ڕادەی هەژاری پێویست هەیە بە ماڵ... بە ڕادەی نەزانی پێویست هەیە بە زانست.. بە ڕادەی نەخۆشی پێویست هەیە بە دەرمان. ئێمە لە سەرەتای هەموو کارێکداین. دووهەزار ساڵە دەتلێینەوە.. تروسکەی خۆشیمان نەدیوە... تازە بە تازە مەودایێک پەیدا بووە بۆ سوودی کوردەواری تێیدا هەڵسوڕێین، بۆیە لە گەلانی دیکە موحتاجترین بۆ ئازادی لە گوفتار و نووسین و کردار و توێژینەوە بێ ئەوەی یەکدی بترسێنین وەیا مەیدان لە یەکدی تەنگ کەینەوە. هەموومان یەک دڵ و یەک دەست و یەک ئامانج بایی هەڵگرتنی ئەو ئەرکە ناکەین وا بە سەر شانی کوردەوەیە. دەوجا دەبێ حاڵمان چی بێ کە خەریکی دوشمنایەتی بین لەگەڵ یەکتر و بەوەدا دەرگەی کرایەوە لە ڕووی خۆمان داخەینەوە..."[2]

عارەبیخوێن لەوەی سەرەوە بۆی دەردەکەوێ کە جنێو و جنێوفرۆش بە بەڵگەگەلێکی خۆیی و بابەتی تۆمەتبار دەکەم و کەلێنێکم نەهێشتۆتەوە بیانوو و ڕێدانی جنێو لێیەوە دزە بکا بە تایبەتی لە

---

[2] ئەو دەقەم لە کوردییەکەوە گواستەوە کە لە سایتی مامۆستادا بڵاو کراوەتەوە، بەڵام لە هەندێ جێدا گومانم لە گواستنەوەکەی هەبوو بۆیە نەختێ دەسکاریم کرد. (وەرگێڕ)

مەیدانی ڕۆشنبیری کوردیدا کە عەشقم بۆ ڕاستگۆیی و پاکی تیایدا دەگاتە ئاستی پیرۆزی. هەندێ لە برایان ڕووبەڕوو پێیان گوتم کە پێویستە ڕووبەڕووی ئەوانە بوەستمەوە کە هێرشبردنیان بۆ سەر نووسینەکانم کردۆتە پەردە بۆ سووکایەتی و بەردەوامبوون لە شەڕەجنێودا بەڵام لەوەدا هەستم بە بچووکبوونەوەیەک کرد کە ئەو مەقامە بەرزەی کە تێیدا خەریکی لێکۆڵینەوەم لە ژیانی حاجی قادر ڕەتی دەکاتەوە و جگە لەوەش دەبێ چ دڵێکم بەوە خۆش بێ یەکێ لە حوکمەکان، مۆری تاریکیی بەو قسانەوە بنێ کە لە سەر ئەوەشەوە بە شێواوی لەدایک بوونە شایەدی ڕاستگۆشن بۆ پاکڕاگرتنی نووسین و جەوهەری من. ئەوەشی بە تەنگی کەرامەتی خۆیەوە بێ، لە بەرگریکردندا لەوەی پتر ناوێ بێبەری بێ و ئەوەش بوختانە تێکدەرەکە خۆبەخۆ دابینی دەکا چونکە درۆکەی گردەبڕە و لەوە بوینەتەوە هەڵبەستراو بێ یا نەبێ. ئاو چ گوێی بەوە داوە بەرد پێی بڵێ تۆ ڕەقیت و لە بەرت ناڕوا! یا جارێ لە جاران شتێکی گرنگ لە هەموو ڕۆژگاراندا لە دەست دڵڕەقی زیانبەخش خەلەساوە؟ مەسەلەی نێوان ئەوەی من دەینووسم و ئەوەی ئەو لە بواری جنێودا دەینووسێ بۆ ویژدانی نەتەوە و بڕیاری مێژوو هێڵدراوەتەوە. خۆ ئەگەر تای تەرازووی ئەو لە تای من قورستر بوو، کارەساتەکە لەوە گەورەتر دەبێ دڵم بدرێتەوە و بکەوێتە بەر پێوانەکاری دادگا و ویژدان لە بواری خۆیدا و ئەگەر ویژدانی گشتی هەڵە بێ و بڕیاری مێژوو تەرە بێ، من چ هەقم بەسەرەوە و تەنانەت حاجی قادریش چی لەوە داوە!

ڕەنگە خوێنەری عارەبی پێی سەیر بێ ئەگەر بڵێم جگە لەو نووسینەی کە لە العراقدا بڵاو بۆتەوە، هیچ نووسینێکی هەڵبەستراوی لەو بابەتەم نەخوێندۆتەوە ئەگەر ڕاستەوخۆ بۆ خۆم یا بۆ کۆڕی زانیاری کورد

نەهاتبێ و ئاگاداریشم لێیان هەر ئەوەندەیە بێ ئەوەی مەبەستم بێ بەر گوێم کەوتووە و لە لایەن دۆستانەوە باس کراوە. ئەگەر لە بارودۆخی وادا هەڵوێست بە پێی باوەڕ و تەبیعەت بگۆڕێ مەزەبی من هاوتەریبی ئەو حیکمەتەی قورئانە کە دایناوە بە بێ گوێدان بە لای لەغوەدا تێپەڕم و لەگەڵ نەفاماندا قسەم نەرم بێ. بۆ ئەم ڕێبازەش یەک هۆی بەهێز هەیە کە ڕێی ترم لێ دەگرێ چونکە دابەزین بۆ هەڵدێری قسەی سووک خەسارەتێکی تێدا دەبێ کە جێی پڕ ناکرێتەوە و لە لایەکەوە دەرفەتی دەگمەن بەوانە دەدا کە سروشتیان شەڕەجنێوە تا لەو کەرەسە نوێیەوە بەردەوامی پێ بدەن و ژەهری خۆیان بڕێژن. لە لایەکی تریشەوە هەموو هەوڵی زەینی و عەقڵی و هونەری کە بۆ تیژکردنی قەڵەم و قسەی هەرزان کە کەمترین بەهای جوانی لەو بابەتەی تێدا نییە کە لای خەڵکی بەتوانا و دەستڕەنگین دەبیندرێ ئەوەش لە توانای داڕشتن و دەسەڵاتی ڕەوانبێژیدا. خەڵکی سەر بە جنێو و قسەی سووک لە بواری (ڕۆشنبیری!)ی کوردیدا بەشتێکی زۆریان لە تەبعگرژی و توندوتیژی شێواز و ناهەمواری داڕشتندا هەیە و پێچەوانەی نەرمونیانی و ڕوونی و ڕێکی و هەستناسکی و شتی لەو بابەتانە لە خۆدا کۆ دەکەنەوە کە سەرچاوەیان نەبوونی بەها و ڕەوشتە و جێی چەقۆتیژکردن و هاشوهووش دەگرنەوە. دوای ئەو دوو هۆکارە بابەتیانە هۆیەکی خۆیی هەیە لەوەم دوورتر دەخاتەوە لەگەڵیاندا بچمە ناو باسەوە. ڕەنگە زەحمەت بێ مرۆ ئارامی و بەرچاوڕوونی خۆی لە کاتێکدا بپارێزێ درۆیەکی هەڵبەستراو بخوێنێتەوە کە کارەکانی یا هەڵوێستی یا نیەتی دەشێوێنێ و مادام قسەیەکی زۆرم لە بارەی ڕۆشنبیری و بۆچوون و باوەڕ و فەلسەفەوە هەیە بۆ لاوانی کوردی بکەم کە بیری سەرقاڵ کردوون و بە ڕاست و چەپدا دەیانهێنێ و دەیانبا ئەوەی لە هەموو شت پێویستتر و بەکەڵکترە بۆ دەربڕینی جوان

و تێگەیاندنی خاوێن ئەوەیە بە نیەتی پاک و بە بێ غەرەز و بێ گرێی دەروونی دربڕدرێ و ئەوانە شتگەلێکن کەمترین سەرکردنی پاکژی ڕۆحە کە لە خڵتوخاشی کینە و ڕق دەیپارێزێ.

من بە تەنگی خۆمەوەم بۆیە بە دووی قسەهەڵبەستاندا ناچم تا بەرپەرچیان بدەمەوە و بە درۆیان بخەمەوە و ئەگەر ئەوانە بخوێنمەوە کە داهێندراون، نەفس بەرانبەر ئەوانە لاوازە کە ڕقی لێیانە یا خۆشی دەوێن، ئەگەر ڕێ بدەم وەک پەندۆڵی سەعات بە نێوان بەدڵ و نابەدڵدا بێت و بچێ لە ئامانجی بەرز و پیرۆزی خۆی دووری دەخەمەوە و ڕووی لە شتێکی بێبەها دەکەم کە نە خاوەنی شەرەفمەند دەکا نە سوودێکی بۆ کەس دەبێ. چاوەڕوانکردنی بێدەنگبوونی ئەو قەڵەمە بوختانکەرانەش بۆ ئەوەی واز لەو خووە بهێنن یا بە بەڵگە بەرپەرچیان بدەمەوە، وەک ئەوەیە داوای شتێ لە شتێک بکەی پێچەوانەی سروشتی خۆی ڕەفتار بکا:

تەکلیفی شتێ بە پێچەوانەی سروشتی   داواکردنی ئاگرە لە ئاو.

لەم بۆنەیەدا نووسینێکم بیر کەوتەوە کە ساڵی 1960 نووسیومە و ئەمە دەقەکەیەتی: "هەرگیز چاوەڕوانی ئەوە لە بەرهەڵستی سیاسی و بیروڕا ناکرێ بە هۆی دەلیلی بۆش و نەبوونی بەڵگەوە لە دەمەتەقێدا بێدەنگ بێ. ئەدی ئەگەر مەیلی جنێودانیش بێتە سەر لایەنەکانی ململانێ!! لەبەر ئەوە ڕێ بە خۆم نادەم لە مەیدانی چپەچپ و چاوداگرتندا شتێ بڵێم باوەڕم ڕەتی بکاتەوە یا ئەو سنوورە ببەزێنێ خەسڵەتی خراپی تێدا بەدە، ئەگەر گوتم، بۆ نموونە، جنێوفرۆش بێمروەتە، جنێوفرۆشەکە مافی ئەوەی نییە بەرپەرچم بداتەوە بەڵکو دەبێ واز لە جنێودان بێنێ، ئەویش وەک درۆزن و قسەهەڵبەست و

هەموو خاوەن خووە بەدەکان کە هەموو کتێبەکانی ئاسمان و زەوی و زمانی شیعر و پەخشان و قسەی نەستەقی پێشینان و نوێخوازان ناشرینیان کردووە. ئەوانە بە هۆی خراپییەکەوە کە تیایاندا هەیە پێیان خۆش نییە لە ڕیزگرتنی ئەو ناوانە بێنە خوارێ کە خاوەنەکانیان لە بواری بەدگۆڕیندا ناسراون و هەر ئەوەندە ماوە نیشانە بە بەرۆکیانەوە هەڵواسن و تیاشیاندا هەیە ئەگەر باسی گەورەیی کەسێکی تری لە لا بکەی، وەک ئەوەیە جنێوت پێ دابێ. لەگەڵ ئەوەشدا زۆرم ڕق لەوەیە خراپە لەگەڵ کەسدا بکرێ، پێم وا نییە ڕەوشتی بەرز و خۆپاریزی لە جنێو دەروونەخۆشەکان بۆ ئەوە هان بدا زیاتر بەو بوارەدا ڕۆچن و دەبێ بەردەوام بە بەر گوێیاندا بدرێ کە خائین سووکە و درۆزن نزمە و قسەهەڵبەست مەلعوونە و هەندێ لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز ئەو نەهجەیان هەیە و دەبینین لە ئاماژەکردن دەبوێرێ و ئاشکرای دەکا وەک ئەو ئایەتەی لە سەر ئەبوو لەهەب هاتە خوارێ. ئەگەر بوختانی جنیودان بە شۆڕشگێڕان کە بە دەم قەڵەمی منەوە کراوە لە زاری قسەهەڵبەست شیرین بێ، بۆ کتێبی (لینین: لە بارەی ئیمپریالیزم و ئیمپریالستەکانەوە ـ دار التقدم ـ مۆسکۆ ـ 1971) دەیانگێڕمەوە تا بۆمانی باس بکەن چ قسەگەلێکی تێدا دەبینن کە گەورەترین شۆڕشگێڕی سەدەی بیستەم بەوانەی سەنگەری بەرانبەری گوتووە. بۆیان دەردەکەوێ کە ناخۆشترین و ڕووشێنەرترین قسەی بە خەڵکی وەک (کاوتسکی و پلیخانۆف) بووە کە بە لایەوە لە مارکسیزم لایانداوە. ئەگەر ئەوانەی خۆیان بە شۆڕشگێڕییەوە هەڵواسیوە و پەنا بۆ قسەهەڵبەستن دەبەن تا نووسینەکانم لەکەدار بکەن گوایە جنێویان تێدایە، ئەوەتا لەو کتێبە و کتێبێ تری لەو بابەتەدا نموونەی زندووی هەڵنەبەستراو هەن و داوا لەوانە دەکەن کە بە ئەدەبی قسەکردنەوە وابەستەن، هەڵوێستەیەک بکەن.

بەربەرەکانیکردنی مارکسی کورد بەرانبەرم لەگەڵ لەدایکبوونیدا، لە چلەکاندا پەیدا بووە و ئەنجامێکی چاوەڕوانکراو بوو چونکە ئەو لە هەرەتیدا بوو و منیش لە بۆچووندا ئازاد بووم. لەگەڵ گەشەکردنی ئەو هۆکارە ناوەکییەی ناخمدا کە بۆ دەربڕین توانای بە قەڵەم و زمانم دەبەخشی، ئەو بەربەرەکانیکردنەش گەشەی کرد و بە کردنەوەی بواری سیاسیش لە بەردەممدا، زیاتر بوو. لە ڕاستیدا ئەو شەڕە هەر لە سەرەتایەوە یەکلایەنە بوو چونکە من لەوە زیاترم نەکردووە بەرپەرچی ئەو تۆمەتانە بدەمەوە کە مارکسیەکان بە سەر ناکرێکارەکاندا هەڵیدەڕێژن و خەڵکی لە خانەی جیاواز و کۆنەپەرستی و چەوسێنەر و خیانەت، بە پێی چین و بۆچوونی سیاسییان، ڕیزبەند دەکەن. دەستپاکترین کەس و خاوەنی خاوێنترین لۆژیک و خێراترینیان بۆ چاکەکاری، لەوەیە خۆی لە جێیەکدا بدینێتەوە دەوری بە دیواری تۆمەتی چینایەتی و سیاسی و شتی تر گیرابێ و لەو ئەنجامگیرییانە داتاشرابن و زیرەکانە ئەو جلانەی لەبەر کرابن کە لێهاتووترین بەرگدروو بۆی دووریبێ. ئەو تۆمەتبارکراوە بێتاوانانەش بە شێوەی جیاواز کاردانەوەیان دەبێ: هەیانە بۆ وەڵام دانامێنێ و وەک چۆن با بە لایدا دێ و باران دەبارێ و کوللە دێن، ئاوها لە تۆمەتەکان دەڕوانێ و بە دیاردەی سروشتی دەرەوەی ویستی خۆی دایاندەنێ. هەیە خۆی لە لایەنی تۆمەتبارکەر نێزیک دەکاتەوە تا لە داهاتوودا ئەو بەڵایەی لە کۆڵ بێتەوە. هەیە بە لای سەنگەری بەرانبەردا دایدەشکێنێ تا پشتی هەبێ و بپارێزرێ و لە ئاسایشدا بێ. هەیە بێ ئەوەی خۆی پەیوەست بکا باوەڕی مارکسیزمی هەیە و هەوڵ دەدا خۆی لەو تۆمەتانە بێبەری بکا تا دەگاتە ئەوەی بڵێ خۆی مارکسی ڕاستەقینەیە و نوێنەری خەباتی ئەو مەودایەی مێژووە. بەڵام من ڕایەکم هەیە لەگەڵ هیچ کام لەوانەدا یەک ناگرێتەوە.

ئەگەر تۆمەتەکە لە بناغەوە درۆ بێ ئەوەی ڕێزی خۆی و باوەڕی خۆی دەگرێ و باوەڕی بە خۆی و هەڵوێستی خۆی هەبێ بە پێی تۆمەتبارکردنی ئەوان بەرپەرچ دەداتەوە. ئەوان بە کۆنەپەرستی تۆمەتباری دەکەن، ئەم ئەوان بە گێرەشێوێن تۆمەتبار دەکا. ئەگەر باوەڕەکەیان بە بۆرژوایانە دانا، ئەم باوەڕی ئەوان بە کۆزمۆپۆلیتی نانەتەوەیی دادەنێ. ئەگەر ئەوان ئەمیان بەو تۆمەتە باوە تۆمەتبار کرد کە دۆلارخۆرە، شەهامەت و لایەنی مرۆڤانەی لێیان دەوێ ئەوان بە ڕۆبڵخۆر تۆمەتبار بکا.. هەتا کۆتایی ئەو لستە ئامادەکراوەی کە سیی ساڵە هەموو ئاسۆکانی بەر چاومانی تەنیوە و یەکێکیان نییە پێچەوانەکەی بە ڕوویاندا نەدرێتەوە و دیمەنەکەش لە بەر دیدی داد و ویژدان هیچ لایەکی شاراوە نییە و هەر بێتاوانی خۆی لە خۆیدا ئەوپەڕی تۆمەتبارکردنی بەرانبەرەکەیەتی و دەبێ بێتاوان چاوپۆشی لە لاڕێیی و هەڵبەستن و بەرژەوەندخوازی و شایەدیی درۆی ئەو لایەنە بکا. ئەگەر دوای دەرکەوتنی بێتاوانی، هەڵوێستی نیشتمانپەروەری و قوربانیدانی هەبێ، دەبێ لە کاریگەری ئەو تۆمەتبارکردن و گومانانە پاک بکرێتەوە و ئاسانترین ڕێگەش بۆ ئەوە تۆمەتبارکردنی ئەو لایەنەیە کە ئەوی بە پێچەوانەی نیشتمانپەروەری و مرۆڤایەتی و قوربانیدانیەوە تۆمەتبار کردووە و ناکرێ لەو خەسڵەتانەدا ڕاستگۆ بێ و تۆمەتیش بۆ بێتاوانان و خاوەن هەڵوێست داتاشێ. وای دەبینم کە چ ڕێگای مامناوەندی لە بەردەم نیشتمانپەروەرێکدا نییە کە مارکسییە ناوچەییەکان تۆمەتباری دەکەن بەرپەرچی تۆمەت بداتەوە چونکە ئەگەر بێدەنگ بێ خۆی و مەسەلەکەی پێ دەدۆڕێنێ هەروەها ئەگەر بە دەنگیش بێ. ئەم دوو هەڵوێستە کە دوو ڕووی یەک دراون ڕێگای ناوەنجییە و تیایدا ئەوە سەرکەوتوو دەبێ کە خەڵکی تۆمەتبار دەکا و خۆ ئەوەندەی بەسە بەرانبەرەکەی بەوەوە خەریک بکا تۆمەت لە

خۆی بکاتەوە و سەرلەنوێ کەسایەتی خۆی لە پارچەکانی ناوی زڕاوی دامەزرێنێتەوە و وای لێ دێ بە کەسێ بچێ بەبێ جووڵە لە نەخۆشخانەدا کەوتبێ و چاوەڕوانی چاکبوونەوە بێ. سروشتی کارەکانیش وایە کە هێرشی مارکسیەکان بۆ سەر لایەن و خەڵکان سەرەتای شەڕێک بێ لە نێوان خۆیان و خەباتگێڕان و نیشتمانپەروەرانی تردا بە تایبەتی لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا کە عەشقی مارکسیزم تیایاندا لە مەودایەکی خەباتی ڕزگاریخوازیدا ڕاستییەکە و هەموو لایەنەکانی تری بزووتنەوەی نیشتمانی دەگرێتەوە و زۆربەی کاتیش لایەنێک لە سەردەمی شەیدابوونیدا بەو فەلسەفەیە سەرەتای تریش بێ بۆ سەر لایەنی ڕەسەنی فکرەکە کە شیوعییەتە، چونکە بە هۆی نەبوونی ئەوینی ئەو فەلسەفەیەوە دەرکەوتن وەک دڵسۆزێکی پاک لە بەر چاوی شیوعییەت و ئومەمیەت دەبێتە یەکێ لە ئەرکە سیاسییەکانی ڕۆژانە و یەکێ لە دەنگەکانی ئەدەبیاتی و ئەوپەڕی ئاواتی ئەوە دەبێ شەرەفی ئەوەی بەرکەوێ کە لە بەرەیەکدا ئەندام بێ شیوعی تێدا باڵادەست بێ و شانازی لەوەدا دەبینێ کارەکانی لە لایەن ئومەمییەتەوە پشتگیری لێ بکرێ. بەڵام ئاشکرایە ئەوە لە بەرەنگاربوونەوەی کۆمۆنستەکان چەپارەیان نادا مەگەر کۆمۆنیزم هەست بکا دەتوانێ لەخۆی بگرێ و بەرەو جێیەک پاڵی بنێ خۆی بیەوێ بۆ ماوەیەک کەڵکی لێ وەرگرێ تا بە هەندێ ئامانجی سنوورداری خۆی بگا و ئەگەر تەڕاییشی تێدا نەهێڵێ و بەرگری تێدا نەمێنێ، ئەوجا لەناوی دەبا، ئەگەر بۆی بلوێ، بۆ یەکجارەکی. چ گومان لەوەدا نییە و مەودای ئەنجامنەدانی نییە تا ئەو ڕۆژەی کۆمۆنیزم دەسبەرداری شێوەی پاوانکردنی نوێنەرایەتی پرۆلیتاریا دەبێ و کۆمەڵگە وا پیشان نەدا کە بینایەک بێ و شەڕی توێژاڵەکانی بە قەدەر دورکەوتنەوەیان لە هەژاریی گەورەتر دەبێ و بەشی

خەباتگێڕانیش لەو خراپەکارییە بە گوێرەی پەیوەندییان بێ بەو توێژانەوە یا نوێنەرایەتی کردنیان. ئەم ڕاستییەش لە ئاستی بەڵگەنەویستەکاندایە و بەر لەوەی بەدبەختی بە سەریدا بسەپێنێ قورئانی پیرۆز پیشانی داوی و ئەگەر تۆمەت بە سەر فەیلەسووف و بیرمەند و هونەرمەند و ئەدیبەکاندا دابەش بکرێ و چینایەتییان بۆ ئامادە بکرێ کە لە یەکەم هەناسەدا دەبێتە بیانووی تۆمەت، بەرەو ئەوە دەڕوا لە هزری کۆمۆنیزم دابڕێن و ئەگەر هەموو ڕۆشنبیران بە گشتی کە کۆمۆنیزم لێیان ڕازی نییە و پتر لە نیو سەدە لەمەوبەر بە (Mental prostitute قەحپەی فکری) ناو ببرێن ئەنجامێکی سروشتییە ئەگەر هەڵوێستی تێکۆشانیان جۆرێ نەبێ لەگەڵ ئارەزووی کۆمۆنیزمدا یەک بگرێتەوە، ناوێکی بەدتر و ناخۆشتریشیان لێ بندرێ. لە ڕاستیدا، شیوعی هەڵوێستی خەڵکی سەربەخۆی تێکۆشەری دەرەوەی کۆمۆنیزم دەکاتە بەڵگەی سەپاو و گردەبڕ بۆ ڕاستی ئەو تۆمەتەی کە لە ناوەخنی تیۆرییەکەدا بۆی دانراوە و بەردەوام هەوڵ لەگەڵ کەسانی بێ لایەندا دەدەن و دەیورووژێنن و بە پیلانگێڕ تۆمەتباریان دەکەن و ئەگەر بۆ بەرگریکردن لە خۆی ڕاستیش بێتەوە، دەیکەنە بەڵگەی دروستیی پێشبینیەکانیان لە خیانەتکاریدا، وەک ئەوەی مرۆ مافی ئەوەی نەبێ بەرگری لە خۆی بکا با هێندەی بەرگریکردنی بەرخێکیش بێ کە چەقۆ دەگاتە ملی بۆ دەربازبوون خۆ ڕادەپسکێنێ، کە بە خیانەتکاری لە سەری حسێب ناکرێ.. بە پێی بۆچوونی کۆمۆنستەکان، هەڵوێستوەرگرتن و بەرەوڕوو بوونەوەیان هەڵوێستی شەریفانە نین و بەڵگەی گردەبڕی ئەوەش ئەوەیە هەر کەسێ بەرەو ڕوویان بێتەوە، دەبێ لە یەکەم دەرفەتدا لە ڕەگوڕیشەوە هەڵکێشرێ و ئەوپەڕی لێبوردەیی شیوعی بەرانبەر هەڵوێستی سەربەخۆ ئەوەیە بیخاتە سەر لایەنێکی نەیاری خۆی و ئەوەش وەک

ئەوەیە چاوپۆشی لەو خۆبەخشانە بکا تا خزمەتی ئەو لایەنە بکەن. لە بارودۆخێکدا کە مەودای بزاوتنیان بووبێ ئەو بابەتە ڕەفتارانەم دیوە و خەڵکی تریش دیویانە و لە ژمارە نایەن. باسکردنیشی لێرەدا لە بەر پێویستیەتی تا ئەوە ڕوون بێتەوە چۆن شیوعیەکان منیان بە بەرهەڵستی خۆیان داناوە و منیش لەو بوارەدا، جگە لە نموونەیەک هیچی تر نیم و لە هەر شوێن و کاتێکدا کە بۆچوونی سەربەخۆی چالاک شانبەشانیان هەبێ، دووبارە دەبێتەوە. ڕەنگە سوودی هەبێ باسێک لە چارەکە لاپەڕەیەکدا بۆ خوێنەری عارەبی بگێڕمەوە کە لە بارەی مەلحەمەی شیوعیەکانەوەیە لە بەرەوڕوو بوونەوەی هەموو شتێکدا کە بێدەنگبوون لە ئاستیدا لەدەستدانی یەکێکە لە بەرژەوەندەکانی ئەگەرچی لەو ڕووبەڕووبوونەوەیەدا ئەوپەڕی دوژمنایەتی و دەستدرێژیش هەبن و ئەم چارەکە لاپەڕەیە یەکێکە لە چەند لاپەڕەیەکی تری زۆر کە لە تاقیکردنەوەی خۆمەوە درکم پێ کردوون و خوا ئاگادارە هەرە سووکەکەیانم هەڵبژاردووە کە شانی شیوعی کورد دەگرێتەوە. ئەم لاپەڕەیەش گرنگییەکی ڕێژەیی نەبێ تیایدا نییە کە لە سەر یەک ڕووداوی دیاریکراوە لە پێناوی مەبەستێکی زۆر کەمدا کە ئەوەی لە نێوان ئەوان و مندا هەیە، ڕوونی دەکاتەوە و چەندی وا، ملیۆنان ملیۆن ڕووداوی سنووردار تاکی بێ تاوانی مرۆڤ لە لافاوی ئومەمیەتدا نقوم بووە و دەنگی ڕەوای تاک لە ناو گرمەی ڕووداواندا خنکاوە.. هاوینی ساڵی 1953 وەک ئاماژەی پێ کراوە، لە بارەی ڕاپەڕینی وەرزێرانی ناوچەی هەولێر و مەخموورەوە دژی لابردنیان لە سەر ئەو زەوییانەی مڵکی ئاغاکان بوون و ئەوان کاریان تێدا دەکردن ڕازی نەدەبوون جێ بۆ ئەو تراکتۆرانە چۆڵ بکەن کە هەر یەکەیان بە لای کەمەوە جێی دە وەرزێری پڕ دەکردەوە. کاردانەوەی حکوومەت بەرانبەریان نەرم نەبوو و دیارە دژی

داخوازییه‌کانی وه‌رزێران بوو که‌ به‌ گوێره‌ی یاسای ئه‌و ده‌مه‌ ده‌ستدرێژکه‌ر بوون. ئه‌و ده‌مه‌ له‌ خولی سێزده‌یه‌مینی په‌رله‌مانی عیراقدا نایبی کۆیه‌ بووم[1] و نوێنه‌ری بۆچوونه‌کانی پارتی دیموکراتی کورد بووم که‌ مۆڵه‌تی نه‌بوو و منیش ئه‌ندامی بووم. که‌ هه‌واڵی وه‌رزێرانی هه‌ولێر بڵاو بووه‌وه‌، له‌ ویژدانم چه‌سپا ئه‌وپه‌ڕی هه‌وڵ بۆ لایه‌نگرییان بده‌م و مافه‌کانیان و ئه‌و مه‌ترسیانه‌ی لێی ده‌وه‌شایه‌وه‌ لێی بکه‌وێته‌وه‌ بخه‌مه‌ به‌ر چاو. له‌ یه‌که‌م کۆبوونه‌وه‌ی په‌رله‌ماندا به‌ توندی بابه‌ته‌که‌م خسته‌ به‌رده‌م به‌رپرسان که‌ فه‌لاحه‌کانیان به‌ ته‌نها به‌رانبه‌ر سوودمه‌نده‌کان لێگه‌ڕاوه‌ و ده‌رده‌کرێن و غه‌دریان لێ ده‌کرێ و غه‌دریش مه‌ترسی به‌ڕێوه‌بردن و ئاسایش و دارایی به‌دوودا دێ و هه‌مووی به‌ سه‌ر حکوومه‌تدا کۆمه‌ڵ ده‌بێ. گوتاره‌که‌ ده‌نگدانه‌وه‌یه‌کی زۆری هه‌بوو و ڕۆژنامه‌کان له‌ یه‌که‌م لاپه‌ڕه‌دا به‌ مانشێته‌وه‌ بڵاویان کرده‌وه‌. ئه‌و گوتاره‌ نووسینێکی وه‌ک سه‌روتار له‌ ڕۆژنامه‌ی (الدفاع)[2] به‌ دوودا هات که‌ خالێخۆشبوو (صادق البصام)ی نوێنه‌ری به‌غدا خاوه‌نی بوو و کاریگه‌رییه‌کی وای هه‌بوو به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی حکوومه‌ت له‌ هه‌ولێر خاوه‌ن زه‌وییه‌کانی ئه‌و ناوچه‌یه‌ی له‌وه‌ مه‌نع کرد مه‌کینه‌کانیان به‌کار بێنن که‌ ململانێی تێدا هه‌بوو، ئه‌وه‌ش بۆ ئه‌وه‌ی دووچاری ئه‌وه‌ نه‌بن که‌ من له‌ گوتار و نووسیندا پێشبینیم کردبوو.

---

[1] هه‌ڵبژاردنم وه‌ک نائیبی کۆیه‌ ساڵی 1953 یه‌که‌م ململانێی هه‌ڵبژاردنی ڕاسته‌قینه‌ بوو له‌ هه‌موو ناوچه‌ کوردییه‌کاندا و یه‌که‌م هه‌ڵبژاردنیش بوو که‌ سه‌رکه‌وتنی به‌ده‌ست هێنا. یه‌کێ ئه‌و کاردانه‌وه‌ لاوه‌کییانه‌ی لێی که‌وتنه‌وه‌ ئه‌وه‌ بوو کۆمۆنسته‌کانی ناوچه‌که‌ له‌ پۆلیس زیاتر دژایه‌تی هه‌ڵبژاردنه‌که‌یا ده‌کرد. درێژه‌ی ئه‌و باسه‌ لێره‌دا جێی نابێته‌وه‌.

[2] یه‌کێ له‌ هه‌ڵوێسته‌ جوامێرانه‌کانی سادق به‌سام ئه‌وه‌ بوو که‌ به‌ بێ ترس سینگی ڕۆژنامه‌که‌ی بۆ هه‌رچییه‌کی ده‌مگوت و ده‌منووسی کردبۆوه‌ چونکه‌ منی له‌ په‌رله‌ماندا به‌ نوێنه‌ری ڕای کورد ده‌زانی، خوا لێی خۆش بێ و جه‌زای بداته‌وه‌.

وەرزێرەکان هەڵوێستی منیان پێ باش بوو کە لە بنەڕەتدا هەڵوێستی پارتی دیموکراتی کورد بوو، کە تاکە حیزب بوو لە ناوچە کوردییەکاندا ململانێی کۆمۆنستەکان دەکرد. وەرزێران ئەو پێخۆشبوونەیان بە شێوەی جۆراوجۆر دەردەبڕی و گەورەترینیان ئەوە بوو بە سەدانیان، دەستە دەستە هاتنە بەغدا و ئەوە یەکەم جار بوو هەست بە جۆرە هاوسۆزییەکی ویژدانی بکەن لە خواستەکانیان ئەوەش لە یەکێ لە ئەندامانی ڕێکخراوی ڕەسمییەوە. دەنگی من تاکە دەنگی ڕاگەیەندراو بوو لە هەموو عیراقدا[3] کە بۆ بەرگریکردن لێیان بەرز بووەوە و ئەوەشی بەرانبەر دەسەڵات بەرگری لێ کردم ئەو حەسانەیە بوو کە ئەندامانی پەرلەمان هەیانبوو و ڕێگا نادا دەستی دەسەڵاتیان پێ بگا و دەنگیان کپ بکا. با ئەوەش بڵێم ئەو هەڵوێستەم بووە هۆی ئەوەی فایلێکی تایبەتی لە دەزگا نهێنییەکانی وەزارەتی ناوخۆدا بۆ من بکرێتەوە گوایە سەر بە کۆمۆنستەکانم. لە گەرمەی ئەو سەرقاڵی و کێشانەدا، کە زۆر ڕوو و ڕەهەندیان هەبوو و قورساییان لە سەر هەموو کەسێک هەبوو پەیوەندی پێیانەوە هەبوبێ، لقی شیوعی لە هەولێر نەشرەیەکی بە زمانی کوردی بڵاو کردەوە کە (شیکردنەوە!)ی ئاشکراکردن و (گوتەکان!)ی مارکسیزمی لە تێگەیشتنێکی ڕاستیدا! و هەستکردنی ساغ! و تیشکی ڕۆشنکەرەوە! بۆ سەر ناوەڕۆکی کێشەکە لە ژێر سەرناوێکی جوانی ئیشتیهاکەرەوەدا بڵاو کردەوە و ئەمەت پێ

---

[3] هەوڵمدا قەناعەت بە نوێنەران بێنم داوایەکی ڕوونکردنەوە ئاڕاستەی حکوومەت بکەن لەو غەدرەی کە لە جوتیاران دەکرا و لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکەن. لە داوایەکی پێشتردا ژمارەی بەرهەڵستکاران 13 کەس بوون بەڵام لەمەیاندا ژمارەیەکی کەم نەبێ کەس ئامادە نەبوو، ئەوانەش خوالێخۆشبوو شێخ ڕەزا شبیبی و ذیبان غەبان و لە زندووەکانیش خوا تەمەنیان درێژ بکا، مامۆستایان حەسەن عەبولڕەحمان و ڕەزاق شێخلی و نەجیب صائیغ بوون. داوای ڕوونکردنەوە، گەورەترین کار بوو کە پەرلەمان لەگەڵ حکوومەتدا پێی بکرێ.

دەڵێ: نیازخراپی مەسعوود محەمەد".. نەشرەکە پڕ بوو لە شێواندن تا ئەوەی دەگاتە پلەی هیچ و سەرەوخوار بە مەبەست و دژبەیەک چونکە نەیتوانیبوو یەک وشەی ڕاست لەخۆ بگرێ یا وشەیەکی بێلایەنی نێوان ڕاست و ناڕاستی تێدا بێ و ئەوەندە لە ڕاستی دوور کەوتبۆوە گەنجێکی وەرزێری سەر بە پارتی دیموکراتی کوردی چالاکی ناوچەی ململانێکەی بەوە تۆمەتبار کردبوو کە نوێنەری منە و پڕوپاگەندە لە ناو وەرزێرەکاندا بڵاو دەکاتەوە تا بەرەو لای من ڕایانکێشێ و منیش ئەو دەمە ئەو گەنجەم نەدەناسی و ڕەنگە ڕاستتر بێ بڵێم پێشتر نەمدیبوو و دوای بەیانی ئازاری ساڵی 1970 سەردانی کرد و هێشتا مێشکی پڕ بوو لە بیرەوەرییەکانی ئەو دوو ساڵە و ڕەنگە لە هەموو کەس باشتر ناوەڕۆکی ئەو نەشرەیەی لەبیر بێ.. ئەگەر مرۆ لە لێکدانەوەی بابەتدا یەخەی تێگەیشتنی خۆی نەگرێ، باشترین پێوەر بۆ پێوانەکردنی ڕاست و ناڕاستی و ڕەسەن و ناڕەسەن شتێکی چەسپاوی گومانهەڵنەگرە و ناشێ لە یەقیندا بگەینە پلەیەک لە سەرەوەی چەسپاوەکانی نەفسدابێ. ئەگەر لە ڕوونی دڵم و پاکی مەبەستم و بەرزی ئامانجم لە بابەتێکدا دڵنیا بم و یەکێک ڕاست بێتەوە و ناخم تۆمەتبار بکا و بڕیاری نیەتخراپیم بە سەردا بدا دەبێ لە وێرانبوونی ویژدانی و شەڕخوازی ناخی و قینی لە تەشەنەکردنی چاکە لە ناو خەڵکدا و ناحەزی لە چاکەکاریدا دڵنیا بم چونکە ئەو یەقینە ئەنجامێکە و لێبۆتەوە و ڕاستیەکەی گردەبڕە و بەرانبەر چاکە و جوانی و بەرز وەستاوەتەوە. بە هیچ جۆرێ کەس ناتوانێ لە ڕێی بەڵگەوە لە ڕاستی شتێکی کەسێکی تر دڵنیا بێ مەگەر چاوی بنووقێنێ و دیدی کوێر بێ. ئەگەر ناوت بەکر بێ یا زەید بێ و یەکێ بێ و بڵێ تۆ ناوت عەمرە و یا نیازێکی خراپی هەبوو بەڵگەی لەوە گەورەترت دەست ناکەوێ کە قسەکەی درۆیە و ئایە چاوەڕێی ئەوەی لێ دەکەی لە

باسکردنی جوگرافیا و کیمیا و ژیانی نەهەنگدا تەمای ئەوەت پێ بدا بە بەڵگە بەرپەرچی بدەیتەوە تا بەوە بگەیت کە بە درۆی بخەیتەوە؟ نابینی لە بوختانکردندا بە پێناسەت چەند بێ باکە و ئەوەندەش خۆی ماندوو ناکا لە نفووس بە دوای ڕاستییەکەدا بگەڕێ و خۆی بە تەماشاکردنی وەرەقەی پێناسەکەتەوە سەرقاڵ بکا یا پرسیار لە خۆت بکا یا لە کەسێکی بکا کە دەتناسێ بەڵکو هەر بەخۆی بووە وەکیل و حاکم و شایەد لە تایبەتمەندترین شتێ کە هی تۆیە و درۆ لەوە ئاشکراتر دەبێ؟ ئەگەر مرۆ توانای نەما و ئیرادەی لە دەست دا و نەیتوانی باوەڕێکی تایبەت بەخۆی دامەزرێنێ، لە ناو مرۆڤە ئازادەکاندا کە توانای هەڵبژاردنیان هەیە جێی نابێتەوە و مافی لە داخوازی بەها بەرزەکاندا لەدەست دەدا و هەست بەو ڕێژە پێویستەی نێوان شتە گونجاوەکان و پێچەوانەکانیان ناکا. چی لەو کەسە دەکەی لە ئاستی شتێکی ناو دەستی کە لە بوونی دڵنیایە بێدەنگە کەچی کێشەی ئاڵۆزکاوی دوور لە خۆی بە سووربوونەوە قەبووڵ دەکا یا ڕەتی دەکاتەوە، ئەوەش لە ڕێی بۆچوونێکی تایبەت بە خۆیەوە و هەر ئەوەی بۆ دەمێنێ تیایدا دەروێشی گوێڕایەڵ بێ بۆ ئەو باوەڕەی کە پێی دەگا و ویژدانی دەکاتە کۆپییەکی ویژدانی تر. ئەوەم بەلاوە ئەوپەڕی دارمان و لەناوچوونی کەسایەتییە و هەوڵم داوە هەرچۆنێ بێ خۆم لەو جێیانە دوور بگرم کە ئیرادە و سروشتیان تێدا دەتوێنەوە و سیمای خواستراوە یا سەپێندراو لەبەر دەکرێ. هەرگیز لەوەدا گوێڕایەڵ نەبوومە باوەڕی خۆم بە باوەڕی کەسێکی مەزن بگۆڕم کە هەوڵ دەدرێ خەڵکی بەدوو بکەون، هەڵەیەکیش بە ڕاست بزانم و بە ویستی خۆم دوای کەوم لەوەم پێ باشترە لە ترسان یا بە تەماح دووی ڕاستییەک بکەوم کە بە هەڵەی دەزانم. ئەدی ئەگەر ئەوەی دوای دەکەوم ئەوپەڕی چاکە بێ و پێویستی بە لێکدانەوە نەبێ، چ

هەڵوێستم بەرانبەر ئەوانە هەبێ بەڵگەی خراپەی بۆ هەڵدەچنن و دوژمنایەتی چاکەی بەبەرەکەتی بەر دەستم دەکەن؟ لەم بارەیەوە و لە ئاستی باوەڕهێنان بە ڕاستگۆیی خۆم و درۆی ئەو لایەنە کۆتایی پێ ناهێنم بەڵکو بەڵگەی بەهێزیشم لە لا پەیدا دەبن بۆ درۆکردن لە بابەتی ئەوتۆدا کە زانیارییەکی کەمم لە سەریان هەبێ و بەشی ئەوە نەکا بەدرۆخستنەوە و نەخستنەوە دەربخا، مافی ئەوەم هەیە بە لای کەسێکدا دایشکێنم و بێتاوانی بکەم ئەگەر ئەوەی قسەی بۆ من هەڵبەستابێ شایەدی لە سەر دابێ. نەشرەکەی حیزبی شیوعی لە هەولێر و هەڵوێستی تری پێش ئەوە و پاش ئەوە بەسن بۆ ئەوەی بگەمە ئەو باوەڕەی کە کوردی شیوعی لە باشترین حاڵدا و بە چاوپۆشین لە کارە زەرەربەخشەکانی تری، لەوەی کە دەیڵێ نیوەی حەقی لەگەڵدایە لەوە وای بۆ چووم ئەوەی کوردی شیوعی بەربەرەکانی دەکا لە خراپترین حاڵیدا ئەو خراپییەی هەیە کە پێی دەگوترێ و لەمەدا بە لای شیوعی ناوچەییدا دایدەشکێنم لە بەر ئەوەی تەرەفێکی بەردەوامی بزووتنەوەی نیشتمانییە و بەڵگەی نەگونجانی گردەبڕم لە نێوان شتێکی سەرلەبەر ڕاست و شتێکی سەرلەبەر درۆ لە تاقیکردنەوەی خۆم لەگەڵیاندا وەلاناوە و ئەمەش ئەوپەڕی لێبوردەییە کە ئەو ویژدانە زندووە پێی هەڵسوڕێ کە هەر کێشەی ئاڵۆز لە نێوان پیرۆزیە ڕاستیەکان و بەرژەوەندی گشتیدا دادەنێ کە کەموکوڕی کەوتۆتە ناو هەندێ ڕاپەڕاندنیەوە...

ئەوجا: قسەم لە سەر ئەم بابەتە و ڕۆچوون بەم زەریایەدا کۆتاییەکی دیاری نییە و ئەگەر قەڵەمم دەست هەڵگرێ و لەم ئاستەدا بوەستم وا لەخۆم دەکەم بەرەوڕووی خراپەکارییەکی گەورەی کۆن و بەردەوام

ببمەوە ئەوەش بە چاوپۆشیکردن لە سێ شتی گرنگ کە ژماردنیانم پێ ئاسانە:

یەکەمیان ئەوەیە ژمارەیەکی کەمی ئەو ڕووداوانەم باس کرد کە کوردی کۆمۆنست ویژدان و کەرامەتی کوردی ئازادیخوازیان پێ خستۆتە بەردەمی تاقیکارییەوە.دووەمیان ئەوەیە خۆم ناخۆشترینی ئەو ڕووداوانەم لاداوە کە کەرامەتی مرۆ پێشێل دەکەن و ڕەتی دەکەنەوە و بەوەش دەستم بە بەرپەرچدانەوە و چەسپاندنەوە، لە ڕووی چەندایەتی و چۆنایەتیدا گرتووە و ئەوەش لە بەرژەوەندی ئەو بەرەیەدایە کە من تیایدا وەستاوم.

سێیەمیان ئەوەیە خۆم لە موناقەشەی هەندێ لە قسەکانی مارکس بواردوە و ئەگەر تیایاندا ڕۆچووبام تای تەرازووی باوەڕی من قورستر دەبوو. ئەو گوتانەش کەموکوڕییان ئاشکرایە و بۆ ئەوەش بە سەریاندا بازم نەداوە  سوپاس بکرێم بەڵکو بۆ ئەوەی بیسەلمێنم کە:

ئەوەی توندوتیژی کەمتر بێ، لێبوردنی زیاترە.

دوای ئەوە هیوادارم خوێنەری عارەبی پێی وا نەبێ لاوازی گەیاندوومیەتیە ئەو ئاستەی چاوەڕوانی شەکانەوەی ئاڵای سەرکەوتن بم بە سەر نووسینێکەوە کە هەموو هێزێکی لە بەڵگەکانیدایە و بەرەوڕووی بەرەیەک کراوەتەوە هەزاران کۆتر بە سەر هەر پارچە چەکێکی ئاسایی و ئەتۆمی و ناوکیدا دەفڕن. چاکیش دەزانم کە حەق، ئەگەر هێز لە تایەکەی تردا ببێتە پێوەری قورسایی چەندە.

ئەگەر پێت خۆشە پرسیاری ئەوەم لێ بکە ئاخۆ چ حیکمەتێک لە نووسینێکدا هەیە کە نووسەرەکەی پێشوەخت دەزانێ بەرەوڕووبوونەوەی گەلەکۆمە و هێرش سوودی نییە، منیش وەڵامت دەدەمەوە کە زۆر حیکمەت ئەم نووسینەیان پێ دەوێ و دەستهەڵگرتن لێی وەک گوناحی وازهێنانە لە (فەرزی کیفایە)[1] و یەکەم حیکمەت ئەوەیە حەقیقەت دەیەوێ ئاشکرا بێ و پێشگرتنی زوڵمێکە یەخەی ئەوە دەگرێ کە کردوویەتی، دووەمیان کە پێشتریش باسم کرد، سووربوونی کوردی مارکسییە لە ڕاونان و بێزارکردنی خاوەنی بۆچوونی ئازاد و ئەوانە زۆرن و بێدەنگبوون لێیان لە جوانترین شێوەیدا دەچێتە خانەی پشتگیری زوڵم و پیرۆزڕاگرتنی. سێیەمیان کەموکوڕی ئەم نووسینە لە ڕوونکردنەوەی کاریگەری ڕووداوەکان لە سەر بەلاداخستنی کاروبارە ناوچەییەکان لەو کەموکوڕییە کەمترە کە کوردی کۆمۆنست لە بەلاداخستنی ڕووداوە جیهانیەکاندا هەیانە و لەگەڵ ئەوەشدا لە سەر ئەوە بەردەوامن وزەی کورد بە خەرج بدەن، بە گوێرەی توانا، بۆ خزمەتی ئومەمییەت بە بێ کەمترین ئومێدی گەڕانەوەی خێر بۆ کورد. لەبەر ئەوە بە زایەعچوونی هەوڵی من لە بوارێکی سنووردارداپە و زەرەری لەوە کەمترە تیایدا بەردەوام بم ئەوەش لە چاو بەرەیەکی فرەوانی خەڵکەوە...

---

[1] فەرزی کیفایە (فرض الكفاية) ئەو ئەرکەیە کە بە دەستەجەمعی بە سەر خەڵکدا دراوە و ئەگەر کۆمەڵە خەڵکێک پێی هەستن لە سەر ئەوانی دی نامێنێ، وەک ناشتنی مردوو و خاوێنڕاگرتنی شار و شتی تری گشتی. فرزی عەین (فرض العين)یش ئەرکی تاکە کەسە، وەک نوێژ و ڕۆژوو و زەکات... (وەرگێڕ).

دوا وشەم بۆ ئەوە دەبێ ببێتە میسکی کۆتایی

ئەگەر کۆمۆنیزمی کوردی بتوانێ لەو توندڕەوییە زێدەی خۆی بۆ ئومەمییەت کەم بکاتەوە و هەڵوێستی لە ئاستیدا وەک هەڵوێستی شیوعیەتی فەرەنسا و ئیتالیا و ئیسپانیا بێ تا لە جێیدا نوێنەرایەتی بەرژەوەندی کورد بکا و هیچ نەبێ لەو توانەوەیەی ئێستای لە ناو زەریای مەسەلە جیهانیەکاندا، کە ناوی کورد جێی تێدا نییە، دەرباز بێ، دوای ئەوە هیچ مەرجێکی تری قورسی بۆ دانانێم سروشتە چینایەتییەکەی ڕەتی بکاتەوە یا بە لاوازییەکی ڕێژەیی گران لە سەری بکەوێ یا بارودۆخێکی سەپاو لە دژی بێ. لەگەڵ خۆمدا بەڵێن دەدەم لە ئێستاوە زمانم یا قەڵەمم بە چاکەی ئەو نەبێ نەگەڕێ و بە هەڕەتی هەر پلەیەکی کۆمەڵایەتی و ئابووری بگا و هەڵوێستی بەرانبەرم هەر چییەک بێ گەردنیم ئازاد کردووە لە هەرچییەکی جێی گلەیی بێ با سوپایەک لە ویژدانی وێران و زمانی هاریشم بکاتە سەر. ئەگەر لە بواری کورددا چاکەکار بێ، هەموو گوناهەکانی دەشۆرێنەوە.

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ـ ژمارەی سپاردن لە کتێبخانەی نیشتمانی بەغدا 1183ی ساڵی 1977ە.
19-5-2008 لە دارەتوو، لە وەرگێڕانی بوومەوە. ح.ک